3

# بارزان و زێبار

## لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا

١٢٥٥ - ١٣٤١ کۆچی

١٨٤٠ - ١٩٢٣ زایینی

بەرگی سێیەم

ئامادە و پێشکەشکردنی:
**دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر**

وەرگێڕان: **ئاشتی رەحمان**

بارزان و زێبار لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا

ئامادە و پێشکەشکردنی: دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر

CIHAN UNIVERSITY

# بارزان و زێبار

## لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا



١٢٥٥ - ١٣٤١ کۆچی
١٨٤٠ - ١٩٢٣ زایینی



**بەرگی سێیەم**




**بڵاوکراوەی زانکۆی جیهان**
**خانەی بەڵگەکان**

**٢٠١٨**

ئامادە و پێشکەشکردنی: **د. نەوزاد یەحیا باجگر**

وەرگێڕان: **ئاشتی رەحمان**




• ناوی کتێب • **بارزان و زێبار** لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا
بەرگی سێیەم
١٢٥٥ - ١٣٤١ کۆچی/ ١٨٤٠ - ١٩٢٣ زایینی
• ئامادە و پێشکەشکردنی • د. نەوزاد یەحیا سەعید باجگر
• وەرگێڕان (زمانی عوسمانی) • ئاشتی ڕەحمان
• بەڕێوبەری هونەری • بورهان سابیر
• دیزاینی ناوەڕۆک • هێمن حەساری
• بڵاوکراوەی • زانکۆی جیهان | خانەی بەڵگەکان
• تیراژ • ١٠٠٠ دانە
• چاپ • یەکەم ٢٠١٨ هەولێر





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (      )ی ساڵی ٢٠١٨ی وەزارەتی ڕۆشنبیری

ئەو وشەو بیروبۆچوونانەی کە لەم پەرتوکەدا نووسراوەتەوە سەرچاوە کەی بەڵگەکانەو ئێمە لێی بەرپرس نین، لەبەر ئەمانەتی زانستیش لەکاتی وەرگێڕانی دەستکاری نەکراوە.

# پێشەکی

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن عوسمان غازی کوڕی ئەرتوغرول لە ساڵی ١٢٩٩، ئەو سوڵتانانەی عوسمانی کە یەك لە دوای یەك دەسەڵاتیان گرتە دەست، لە خەمی فراوان بوونی دەسەڵات و خاکی عوسمانی دا بوون، تا گەیشتە ئەو رادەیەی ئیمپراتۆریەتێکی گەورە و فراوان دروست بکەن، بێگومان فراوان بوونی خاك و دەسەڵاتیش لەسەر حیسابی نەتەوە و خاکی میللەتانی تر هاتە دی.

عیراق بە گشتی و خاکی کوردستانیش یەکێك بوو لەو خاکانەی کە بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، دوای ئەوەش کاروباری کارگێری دەوڵەت و کاروباری سیاسی دەوڵەت گۆرانکاری بەسەرهات و لەسەر بنەما، یاساورێسای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی رێکخراو و بەرێوەچوو. ئەو ماوەیەش کە حوکم لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان بوو، بێگومان لە ژێر ئەو حوکمەش چەندین هەوڵ و کۆشش درا و کرا بۆ ئەوەی ئازادی و سەربەخۆی بەدەست بێت، حوکمی خۆ بە خۆیی بونیاد بنرێت، بە دڵنیاییەوەش دەوڵەتی عوسمانی ئەو هەوڵ و کۆششانەی بە ئاژاوەگێر و چەتە ناوبرد، جگە لەوەش کەسانێك هەبوون ئەو تێکۆشانانەی قۆزتۆتەوە تا بە مەرامی بگات و نیازی خۆی جێبەجێ بکات، هەر بۆیە هەر رووداوێك لە ژێر هەر ئالایەك دروست بووبێت کەسەکان بە چەتە و ئاژاوەگێر لە قەڵەم دراون.

یەکێك لەو ناوچانەی کوردستانیش کە بە درێژایی مێژوو کەسایەتی ناودار تێدا سەری هەڵداو یەك لە دوای یەك لە هەوڵ و کۆششەکانیان بێزار نەبوون و بێ هیوا نەبوون، ئەویش ناوچەی بارزان بوو، تێکۆشانی سەرکردەکانی ئەو ناوچەیە وایکرد ئەو ناوچەیە لە رووداوەکان بێبەش نەبن و دەوڵەتی عوسمانیش سڵی نەکرد بۆ ئەوەی ناوچەکە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و شۆرش و راپەرینەکانی ئەو ناوچەیە دامرکێنێتەوە.

هەر بۆیە ئەوەی لە بەڵگەکانی دەوڵەت چ ناوەخۆ بێت یاخود ئەوانەی دەرەوە باسیان لەم راپەرین و رووداوانە کردووە، بە تایبەتی بەڵگەکانی عوسمانی، چونکە ئەو خاکە بەشێك بووە لە خاکی عوسمانی، بە دڵنیاییەوە باسکردنی رووداوەکانیش بە گوێرەی بەرژەوەندی تاکەکان و وڵاتانی ناوچەکە گۆرانکاری بەسەردا دێت.

هۆزی بارزان دەگەرێنەوە بۆ گوندی بارزان کە لەو سەردەمە لە گوندێکی بچووك پێك هاتبوو، دامەزرێنەرەکەشیان شێخ محەمەدی بارزانی بوو، لە سەر تەریقەتی نەقشبەندی، هەرچی هۆزی زێبارە، کە لەم ناوچەیە دەژین، ناوچەکەیان دەکەوێتە باکووری شاری عەقرە، هۆزی زێبار لە گرنگترین هۆزەکانی بادینانن، بە ناوی ئەم ناوچەیە ناونراون کە تێدا دەژین، بەڵام لەم سەردەمەدا لە رووی کارگێرییەوە بارزان سەر بە قەزای زێبار بوو، مێژوونووسان لە بارەی ئاخۆ بارزان بەشێکە لە زێبار یاخود زێبار بەشێك بووە لە بارزان بیرورای جیاوازیان هەیە، بەڵام ئەوەی لە بەڵگەکان دەردەکەوێت لە رووی کارگێریەوە زێبار بە قەزا هەڵبژێردراوە و مەرکەزەکەی بارزان بووە. هەروەك لە بەڵگەکانیش دەردەکەوێت لە سەردەمی عوسمانیەکان ئەو ناوچەیە هەرگیز ئارامی و جێگیر بوونی سیاسی بەخۆیەوە نەبینیوە، بەردەوام لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی یاخود هۆزەکانی ناوچەکە و دەورووبەر لە نێو خۆیان ناکۆکی و ململانێی سیاسی سەریهەڵداوە، ئەمەش وایکردووە هێزی سەربازی دەست لە کاروباری ناوچەکە وەربدات.

خانەی بەڵگەکانی زانکۆکەمان پێشووتر لە بارەی هەولێر ئەو بەڵگانەی پەیوەست بوون بەم شارە لە دوو بەرگ کۆی کردنەوە و خستیە بەردەستی توێژەران و پەیوەندیداران، ئەمرۆش لەبەر گرنگی بابەتەکە و زانیاری مێژووی ئەو سەردەمە وەکو خەمخۆری مێژوو ئەو بەڵگانەی کە پەیوەست بوون بە ناوچەی بارزان و زێبار یاخود دەتوانین بڵێین ئەو بەڵگانەی ناوی ئەو ناوچانەی تێدا دێت، کۆکرانەوە و لە بەرگی یەکەمدا بە (٣٠٠) بەڵگە خستیە بەر دەستی توێژەران.

**د. نەوزاد یەحیا باجگر**

**سەرۆکی دەستەی ئەمینداریەتی کەمپەکانی زانکۆی جیهان**

# چەند ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی بەڵگەكان



1
• لە ناو بەڵگەکاندا هەڵەی ساڵ و مانگ و ڕۆژ کراوە؛ ئەوەی لە بارەی مێژووی ناو بەڵگەکانە ئەوا مێژووی کۆچی و ڕومی بەکارهاتووە، لە هەندێک بەڵگەشدا مێژووی ڕومي یا ئەوەتا کۆچیەکەی نووسراوەتەوە، بە تایبەتی لە ساڵە ڕومیەکە هەڵەی تێدا کراوە.



2
• جگە لەمەش هەڵەی ناوەکان هەیە، بۆ نموونە هۆز و ناوی کەسێتی، شوێن، لەبەر ئەوەی ئەو نووسەرەی نووسراوەکەی نووسیوەتەوە کوردییەکەی باش نەبووە، بە شێوازی سەر زاری خۆی ووشەکەی نووسیوەتەوە، یاخود لە بارەی ناوچە و شوێنەکانەوە شارەزاییەکی ئەوە تۆی نەبووە، زانیاری لە شێوەزاری ناوچەکەش نەبووە، ئەمەش وایکردووە بە هەڵە بینووسێتەوە، هەر بۆیە لە بارەی ناوەکانەوە هەروەکو خۆی نووسراوەتەوە، دەستکاری نەکراوە.



3
• لە بارەی وەرگێرانی بەڵگەکان ئەوا هەروەکو خۆی وەرگێردراوە؛ یەک ووشە زیاد یاخود یەک ووشە کەمی نەکردووە، تەنانەت هەوڵ دراوە لە کاتی وەرگێرانەکە دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان نەکرێت، چونکە ئەگەر بە گوێرەی زمانەوانی کوردی دەستکاری دەستەواژە و ووشەکان بکرابووایە، ئەوا دەبووایە دەستکارییەکی زۆری دەستەواژەکان بکرێت، هۆکاری دەستکاری نەکردنەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەڵگەکان ڕەسەنایەتی خۆیان لە دەست نەدەن، لە هەمان کاتدا خوێنەر و مێژوونووسان لە شێوازی نووسینی بەڵگە و شێوەزاری ئەو سەردەمەی نووسەران ئاشنا بن، کە ئەو بەڵگانە بە چ شێوازێک نووسراونەتەوە، جگە لەوەش کاری نووسەر و مێژوونووسانە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە زانیاری ناو بەڵگەکان ڕوون کردنەوە و شی کردنەوە بۆ بابەتی ناو بەڵگەکەکان بکەن.



4
• لە هەندێک شوێن لە ناو بەڵگەکاندا بۆشایی هەیە، ئەوانیش بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن؛ هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکە هەندێک ووشەی نهێنی هەبووە، نەویستراوە ئاشکرا بێت، بۆیە نووسەرەکە بۆشایی بەجێ هێشتووە، تەنیا ئەوەی نووسراوەکەی گەیشتۆتە دەستی لەم بۆشاییە تێگەیشتووە و زانیویەتی نووسەر یاخود لایەنی پەیوەندیدار مەبەستی چییە.



5
• لە چەند شوێنێکی کەمیش بۆشایی بە خاڵ خاڵ هەیە (...) مەبەستیش لەم بۆشاییە بە خاڵانە ئەوەیە کە ئەو ووشەیە نەتوانراوە بخوێندرێتەوە، زۆر جار ووشە هەیە خوێندنەوەی زۆر ئەستەمە کە نووسەرەکە بە شێوەیەک یاخود بە خەتێک نووسیویەتی ناتوانرێ بخوێندرێتەوە، بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەی هەڵە و لە ووشەی هەڵە دوورەپەرێز بین، بۆ ووشەکە بۆشایی بە خاڵ دانراوە.



6
• هەندێک ووشە یاخود ڕاستترە بڵێن زاراوە هەیە لەو سەردەمە بەکار هاتووە و مانای تایبەتی خۆی هەیە؛ ئەو مانایە نادەن کە ئێمە ڕۆژانە بەکاری دەهێنین و لێی تێدەگەین، جگە لەوەش وەرگێرانی ئەو ووشانە

بۆ کوردییەکەی لە نرخ و ماناکەی تێک دەدات و لە هەمان ئەو ئاستە نابێت، واتە مانای پڕ بە پێستی خۆی لە دەست دەدات، بۆیە نەکراوەتە کوردی و هەروەکو خۆی دانراوە، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەر و مێژوونووسان لە پێناسەی زاراوەکان ئاشنا بن، ئەوا لە (شیکردنەوەی زاراوەکانی عوسمانی) پێناسە کراوە و روون کراوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا زاراوە هەیە، کە زانراوە لە ماناکەی ناگۆردێت، وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی.



7

• جگە لەوانەی کە باسمان کرد بەڵگە هەیە، لە چەندین لاپەڕە پێک هاتوون، ئەو چەند لاپەڕەیەش باسی یەک بابەتی دیاری کراو دەکات، بۆیە لەناویان تەنیا یەک لاپەڕە وەرگێردراوە، چونکە هەموو لاپەڕەکان هەمان بابەت باس دەکەن، جیاوازیەکی ئەوەتۆیان تێدا نییە، بەڵام ئەگەر ئەو چەند لاپەڕەیە باسی چەند بابەتێکیان کردبێت، یاخود هەر هەمان بابەت بەڵام بە شێوازی جیاواز باس کرابێت ، واتە هەر لاپەرەیەک بە شێوازێکی جیاواز باسی بابەتەکەی کردبێت، لێرەدا ئەگەر لە بابەتەکە جیاوازی بەدی کرابێت، هەمووی وەرگێردراوە.



8

• دووبارە بوونەوەی بەڵگە، کەمێک لە بەڵگەکان هەندێک بابەتی دیاریکراو دووبارە بوونەوەی بەڵگەی تێدایە؛ واتە هەمان بابەت لە جیاتی ئەوەی هەمان ژمارەی بدرێتی، وەکو ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد، بابەتەکە لە چەند لاپەڕەیەک پێک هاتووە، ئینجا لە جیاتی ئەوەی هەمووی کۆ بکرێتەوە و هەمان ژمارەی بدرێتی، کەچی بە پێچەوانەوە هەمان بابەت ژمارەی جیاجیایان دراوەتێ، لێرەدا بە ناچاری هەمان بابەت کە لە ژمارەی جیاجیا پێک هاتووە، وەرگێردراوە، چونکە ژمارەیان جیایە و هەمان ژمارەی نەدراوەتێ.



9

• لە هەندێک بەڵگەدا لە کاتی نووسینەوەی رووداوەکان و زانیاری لە بارەی ناوچەکانەوە بە گشتی باسی بابەتەکان کراوە، بۆ نموونە شوێنی عەرەب نشینیش باس کراوە؛ لێرەدا تەنیا ئەوەی پەیوەندی بە کورد و ناوچەکانی کوردییەوە هەیە وەرگێردراوە.



10

• لە نێو بەڵگەکاندا دەستەواژەی دووبارە و رستەی دووبارەی تێدا بەرچاو دەکەوێت، لێرە دا نووسەر لە کاتی نووسینەوەی نووسراوەکەدا هەمان زانیاری یاخود دەستەواژەی دووبارە کردۆتەوە و هەمان زانیاری نووسیوەتەوە.



11

• لە بارەیساڵی بەڵگەکان ئەوا بۆ ڕیزبەندی بەڵگەکان تەنیا ساڵی کۆچی بەکار هاتووە، پشت بە مانگ و رۆژەکەی نەبەستراوە؛ جگە لەمانەش ساڵی ناو بەڵگەکان بە گوێرەی زانیاری ناو بەڵگەکە و ئەوەی سەر بەرگەکەی گۆرانکاری بەسەر دادێت، واتە نووسەر لە کاتی نووسینەوەی بەڵگەکەی ئەم ساڵەی نووسیوەتەوە کە بەڵگەکەی تێدا نووسیوەتەوە، کەچی کە گەیشتۆتە لای پاشا ئەو ساڵەی نووسیوەتەوە کە نووسراوەکەی تێدا بینیوە، هەندێک جاریش ساڵی جێبەجێ کردنەکەی لەسەر نووسراوە، واتە لە یەک نووسراودا مەبەست بەڵگەکەیە چەند ساڵێکی جیاواز بەرچاو دەکەوێت.

**وەرگێر**

# وشەکان

| | |
|---|---|
| ئالای (الای) | ئالای بە مانای کۆمەڵ، قەڵەباڵغ دێت، لە زاراوەی سەربازیش ووشەیەکە لە سێ چوار تابور پێک دێت، هەروەها هەر ئالایەک سەنجەقێکی لە ژێر دەستدا بوو. |
| ئەعیان (اعیان) | لە سەرەتا بۆ بەدواداچوونی بریارەکانی ئەنجوومەنی میللەت ئەنجوومەنێکی تر هەبووە و ئەم ئەرکەیان پێ سپێردراوە، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵانی ۱۸۷۷ و ۱۹۰۸ ئەندامەکانی لەلایەن حکومەتەوە هەڵبژێردراوە. |
| ئەنبار | شوێنێکە بۆ هەڵگرتنی زەخیرە و هەموو کەلوپەلێک بەکارهاتووە. |
| ئەنجوومەنی واڵا (مجلسی والا) | ئەنجوومەنی واڵا لە ساڵی ۱۸۳۷ دامەزرا، ئەم ئەنجوومەنە کاری ئەوە بوو، داواکاری نێوان دەوڵەت و خەڵک جێبەجێ بکات، لە ساڵی ۱۸۶۷ هەڵوەشایەوە و لە شوێن ئەو شورای دەوڵەت دامەزرا. |
| ئستەبڵی عامیرە (اصطبل عامره) | تەوێڵەی کۆشکی پاشا. |
| ئۆچاقلق | ئەو زەویيانەن کە جیاکرابوونەوە و داهاتەکانیان بۆ پارێزگارانی قەڵا و کۆگای چەک دەڕۆیشت. |
| بابی عالی | بنکەی سەدری ئەعزەم، دیوانی هومایۆن لەگەڵ نەزارەتی ناوەخۆ و دەرەوە و فەرمانگەی شورای دەوڵەت دەگرێتەوە. |
| باش کاتیب (باش کاتب) | نووسەری یەکەم یاخود سەرۆکی نووسەران، ئەرکەکەشی لە فەرمانگە فەرمییەکاندا سپێردراوە بە نووسینی نووسراو. |
| باش کیتابەت (باش کتابت) | کیتابەت واتە پیشەی نووسین، باش کیتابەت یەکسانە بە باش کاتیبی، واتە سەرۆکی نووسین. |
| باشبوغ | قوماندانی سەربازی رێک نەخراو یاخود نارێک |
| بەرائەتی شەریفە | واتە پاکانەی ئەستۆ و خۆبەرێکردن، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ وەرگرتنی زەوی کشتوکاڵی یاخود دامەزراندن دەبووایە لەلایەن پاشاوە یاخود دەوڵەت بەرائەتی شەریفە واتە پاکانەی ئەستۆی وەرگرتبووایە. |
| برادەر زادە | برادەر زادە منداڵی خوشک و برا، هەروەها برازا، پورزا، خاڵۆزا دەکات. |
| برادەری | واتە برا. |
| بلۆک (بلوک) | دەستەی سەربازی. |
| بلۆک باشی (بلوک باش) | سەرۆک یاخود بەرپرسی بلۆک. |
| بینباشی (بیکباشی) | بین بە مانای هەزار کەس دێت، بینباشی، ئەو ئەفسەرەیە یاخود قۆماندانەیە کە تابورێک بەرێوە دەبات لە هەزار سەرباز پێک هاتووە. |
| تابور | لەشکری سەربازی، کەرتی سوپا. |
| تاتار | نامەی گواستۆتەوە بۆ ناوچەکانی تری دەوڵەت، جولەی زۆر خێرا بووە، جگە لە ناوی تاتار ئەوەی ئەو کارەی کردووە ناوی (ساعی، پۆستە، قاسد، برید)یشی پێ ووتراوە، لە کاتی خۆیدا تاکی تاتار بە خزمەتی خێرا رۆیشتن بەناوبانگ بووە، بۆیە بەم مانایەی پێیان ووتراوە تاتار. |
| تەحسیلدار (تحصیلدار) | ئەو فەرمانبەرەیە کە باج و باجی داهاتو و بەروبوومی داهات کۆدەکاتەوە. |
| تەرسانە (ترسانە) | یاخود تەرسخانە ئەمەش ئەو شوێنە بوو کاروباری کەشتییە جەنگیەکانی تێدا دەکرا، واتە کارگەی دەریایی و کاروباری دەریایی کە تێدا کارەکانی تێدا جێبەجێ دەکرا، یەکسانە بە تەرسانەی عامیرە (ترسانە عامرە). |
| تەغار (تغار) | چوار ربە یەك تەغارە. |

| | |
|---|---|
| تیمار | ئەو زەوییە کشتوکاڵیانەن کە ساڵانە داهاتیان لە نێوان ٣٠٠٠ ئاقچە لەگەڵ ٢٠٠٠٠ ئاقچە دایە، ئەم جۆرە زەوییەش بەو سەربازانە دەدرا کە لە شەڕ سوودیان لێ وەردەگیرا یاخود بەو کەسانە دەدرا کە لە بواری ئایینەوە ئەرکیان پێ سپێردرابوو، ئەمەشیان بۆ ئەوە بوو تا بژێوی ژیانی خۆیان پێ دابین بکەن، لە جیاتی مووچە پێیان دەدرا. |
| پارە | وشەیەکی فارسیە، یەک قوروش چل پارەیە، یەک پارەش دەکاتە سێ ئاقچە. |
| پۆست نشین | بە شێخی تەکیە ووتراوە پۆست نشین، لە هەمان کاتدا بە کەسێك ووتراوە کە لە پلەیەك دانیشتووە واتە پلەیەکی هەبووە و کارەکەی بەڕێوە بردووە. |
| حەرەم (حرم) | ئەو شوێنەیە کە هەموو کەسێك ناتوانێ بە بێ مۆڵەت بچێتە ژوورەوە، بە تایبەتی ئەو شوێنانەی کە تایبەتن بە ئافرەت و ژووری ئافرەت. |
| جەبەخانە (جبەخانە) | ئەو شوێنە بووە یاخود ئەو کۆگایە بووە هەموو جۆرە چەک و باروت و کەلوپەلی چەکی ئاگری تێدا پارێزراوە. |
| جەلیلە (جلیلە) | جەلیلە ناوداری گەورە، وەزیر یاخود موشیرەکان هەروەها کە نووسراو بۆ فەرمانگەی ئەوان دەکرا، بەم شێوەیە رێزیان لێ دەگیرا، هەروەها لە پلەی ئەوان نزمتر پێیان دەوترا بەهییە یا عالییە. |
| خاخام | زانا و بەرپرسی یەهودیەکان، واتە کاهین. |
| خەلافەتپەناهی (خلافتپناهی) | خەلیفە شوێن گرەوەی کەسێک، کە لە دوای پێغەمبەر وەکو وەکیلی پێغەمبەر، ئەرکێک بوو لە ئیسلام داهێنرا، پەناهی واتە پەیوەندی، خەلافەت پەناهی واتە شتێک کە پەیوەندی بە خەلیفەوە هەیە و لەلای ئەوەوە دەردەچێت. |
| خەیل (خیل) | تاقم، خەڵکێکی زۆر، بە تاقمی سوارەش دێت. |
| خولعە (خلعە) | ئەو جلە بوو چەند جۆرێکی هەبوو، جۆرەکانیشی جلی رێز لێنان، جلی پەشیمانی یاخود جلی مردن بوو، ئەم جلەش لەلایەن پاشاوە بە کەسێک دەدرا. |
| دەرسەعادەت | ئیستەنبوڵ پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. |
| دەفتەردار (دفتردار) | سەرۆکی ژمێریاری، بەرپرس لە کاروباری دارایی. |
| دەفتەر خاقانی (دفتر خاقانی) | دەفتەر خانەشی پێ ووتراوە فەرمانگەیەك بووە کاروباری پارەی دەوڵەت، موڵك و زەوی و زاری بەڕێوە دەبرد، بۆ نموونە تاپۆ. |
| دزدار | پارێزگاری قەڵا. |
| ژورنال | ژورنال دەفتەری ڕووداوەکان، یاخود دەفتەری ڕۆژانە. |
| رایج | رایج بەهاکەی تری، واتە نرخەکەی تری یاخود بەهای رابردووی. |
| رەدیف (ردیف) | بەو سەربازانە وتراوە رەدیف کە لە دواوەی سەربازی رێکخراو دەوەستان و ئەوانەش لە کاتی پێویست چەکیان پێ دەدرا. |
| رەژی (رژی) | فەرمانبەرانی فەرمانگەی تووتن. |
| روزهزر و روزقاسم | (Hıdırellez) لە دونیای تورک وەرزێکە جەژنی بۆ ساز دەکرێت، روزی هزر (Ruz-ı Hızır) واتە (رۆژی هزر) کە بە ناوی رۆژی خدری لەز (Hıdırellez) ناو نراوە، بە پێی داستانی ئەو سەردەمە ئەو رۆژەیە لە سەر رووی زەوی پێغەمبەر خدر و ئیلیاس بەیەک گەیشتوون، تاوەکو یارمەتی هەژار و لێقەوماوان بدەن. لە تورکیاش جەژن بۆ ئەم بۆنەیە دەگێردرێت. بە پێی رۆژژمێری زایینی رۆژی خدری لەز لە ٦ مایس، لە کۆنیش بە پێی رۆژژمێری رومی رۆژی ٢٣ نیسان هەژمار دەکرێت. ماوەی نێوان ٦ مایس تا ٨ تشرینی دووەم بە ناوی رۆژەکانی هزر وەرزی هاوین، هەرچی ماوەی نێوان ٨ تشرینی دووەم تا ٦ مایس بە ناوی رۆژەکانی قاسم وەرزی زستان پێک دەهێنن. بەم شێوەیە رۆژی ٦ مایس تەواو بوونی وەرزی زستان و دەست پێکردنی وەرزی هاوین و رۆژە گەرمەکان نیشان دەدات. |
| روسوم (رسوم) | باج و باجی گومرگ. |
| روسومات (رسومات) | فەرمانگەی گومرگ. |
| ریاسەتپەناهی (ریاستپناهی) | پەیوەستە بە سەرۆکایەتیەوە، کە پابەندە بە کارەکانی پاشا، بۆ نموونە بۆ لایەنی پاشای ریاسەتپەناهی. |

| ریال | ریال پارەی زیوی ئاسیاوییە، دەکاتە ٢٥ قوروش. |
|---|---|
| ریکابی هومایۆنی شاهانە (رکاب هومایونی شاهانە) | سەربازە سوارەکانی پاشا. |
| ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی | بەرپرسی یاخود سەرۆکی دەرگای سەربازە سوارەکانی پاشا. |
| سالیانە | ئەو باجەیە ساڵی جارێك وەردەگیرێت، لە پێش تەنزیمات بەشێك لە فەرمانبەران و بەکارهێنراوان بە ئەرك ساڵی جارێك کرێیان پێ دراوە. |
| سەدارەت (صدارت) | شوێنی کاری سەدری ئەعزەم و پلەکەیەتی. |
| سەدارەتپەناهی | پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، وایە ئاماژەیە بۆ سەدری ئەعزەم. |
| سەدری ئەعزەم (صدر اعظم) | لە دەوڵەتی عوسمانی پلەی لە سەرۆک وەزیرانی ئێستا بووە، یاخود وەکیلی پاشا بووە. |
| سەر عەسکەر (سر عسکر) | سەر وشەیەکی فارسیە بە واتای سەر دێت، سەر عەسکەر بە واتاکانی ئێستا بە مانای سوپا سالار، سەر لەشکر، سەرکردەی سوپا، قوماندان دێت. |
| سەر کاتیب (سر کاتب) | سەرۆک یاخود یەکەم نووسەر. |
| سەعادەت (سعادت) | واتە خۆشی. |
| سەفەربەرلیك(سفربرلك) | چوونە شەر، واتە بەو کەسانە ووتراوە کە خۆیان ئامادە کردووە تا بچنە شەر یاخود بۆ چوونە شەر لە ئامادەباشی دابوونە. |
| سیپاهی (سپاهی) | ئەو سەربازە سوارەیە خاوەنی تیمارە واتە زەوی کشتوکاڵییە، لە لەشکری عوسمانی کۆندا چینێک سەربازی سوارە هەبوو، لە بەرامبەر ئەو دە یەکە (عشر) لە زەوی کشتوکاڵی وەریاندەگرت لەگەڵ ئەو ئاژەڵانەی کە خۆیان بەخێویان دەکرد بەشداری جەنگیان دەکرد، بەڵام کەلوپەلی جەنگی لەلایەن دەوڵەتەوە پێی دەدرا. |
| سیپاهیدار (سپاهدار) | گەورەترین سەرباز، سەر عەسکەر. |
| سیلاحشۆر (سلاحشور) | واتە پیاوی چەکدار، ئەو پیاوانە بوونە لە چەك هەڵگرتن و بەکارهێنانی شارەزاییەکی تەواویان هەبووە، لە شەرەکان بە چەك شەریان کردووە. |
| شاهنشاه | گەورەترین پاشا یا شا، واتە پاشای پاشایان یاخود شای شایان. |
| شەهبەندەر(شهبندر) | بە واتای باڵیۆز دێت، لە سەردەمی مەحمودی دووەم لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ پاراستنی بازرگانە موسڵمانەکانی ناوەخۆ، لە نێوان خۆیان کەسێکیان هەڵدەبژارد تا هەر ناکۆکی و لێك تێنەگەیشتنێك هەبێت چارەسەری بکات. |
| شورای دەوڵەت بە زمانی عوسمانی (شورای دولت) | لە دەوڵەتی عوسمانیدا پێش ئەو دامەزراوەیە، ئەنجوومەنی واڵا کارەکانی دەکرد دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی واڵا شورای دەوڵەت لە ساڵی ١٨٦٨ دامەزرا، جۆری کارەکەی لە کاری کارگێڕی پێک دەهات، ئەرکەکەشی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە کارگێڕییەکان و دەرکردنی یاسای گونجاو بوو، ئەم دامەزراوەیە تا ساڵی ١٩٢٢ بەردەوام بوو. |
| چاوش | وشەیەکی تورکیە ماناکەی سەربازی پلە بچووکە، لە ئەمڕۆشمان لە رووی سەربازییەوە بە پلەی پاسەوان دێت. |
| چەڵتوك (چلتوك) | برنج. |
| ڤۆیڤۆدە | لە سەردەمی عوسمانیەکان ئەو پاشایە بوو، کە سەر بە خەزینە بوو، فەرمانبەرێک بوو ئەو داهاتانەی رێک دەخست کە لەلایەن ئافرەت، ئەفەندی، سەدری ئەعزەم، وەزیر، بەگی بەگان و بەگی سەنجاقەکانەوە دەهات، هەروەها ئەوانە ئەرکێکی تریان هەبوو، ئەویش پاراستنی ئاسایش و رێکخستنی شوێنە تایبەتیەکانیان پێ درا بوو، ئەو شوێنەی ڤۆیڤۆدەکانی تێدا بوون، بەهۆی ئەوەی لە بەرێوەبردنەوە پیاوی هێز بوون، ئەمەش وای کرد بوو ناوە کێشە بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست بکەن. |
| عولوفە (علوفە) | ئەو زاراوەیە بوو کە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا بەو سەربازانە دەوترا کە سێ مانگ جارێک مووچەیان وەردەگرت. |

| فەریق (فریق) | تاقم، تیپ، دوو لایەن، کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر، بە پلەی سەربازیش دێت، لە کۆن لە چینی سەربازی لە دوای موشیر دەهات، ئەویش گەورەترین پلەی سەربازی بوو. |
|---|---|
| فرقە | دەستە، کۆمەڵ. |
| قەپوچوقدار (قپوچوقدار) | ئەرک و خزمەت بوو، ئەو فەرمانبەرانە بوون لە بابی عالی لە ویلایەت لە خزمەتی قەپوکەتهودا دابوون و هەندێک داواکاری والیان جێبەجێ دەکرد. |
| قەپوچی باشی | بەرێوەبەری ئەو چینەیە کە لە بەردەم دەرگای کۆشک وەستاون. |
| قەپوکەتهودا (قپوکتهودا) | قەپوکەتهودا خزمەتکاری دەرگا بوون. |
| قەساس (قصاص) | سزای شەرعی بکوژی کوژراو و بریندارکاری بریندارکراوەکەیە، بۆ میراق کوژراو داوای قەساس دەکەن، وەک بکوژیان قەساس کرد. |
| قپوچی باشی (قپوچی باشی) | قەپوچی بە دەرگای فەرمانگە و شوێنە فەرمییەکانی دەوڵەت دەوترا کە خەڵک بۆ ئیشوکارەکانیان لەم دەرگایە دەچوونە ژوورەوە و دەهاتنە دەرەوە، بێگومان ئەو دەرگایانەش بەرپرس و سەرۆکیان هەبووە، جگە لەوە قەپوچی باشیش پلەیەک بووە دراوەتە فەرمانبەرانی دەوڵەت، بۆ نموونە ریکابی هومایۆنی قەپوچی باشی (رکاب همایونی قپوچی باش). |
| قۆڵ ئاغا (قول اغا) | بە واتای قۆڵ، لێرەش قۆڵی ئاغا یەکسانە بە ئەفسەری یەک قۆڵی تابور، یا خود یاریدەدەری بینباشی، قۆڵی راست و چەپی ئاغا. |
| قولی | قول؛ ئەو پیاوەیە بۆ ئەرك جێبەجێ كردن دەكردرێت، هەرچی قولی؛ ئەو فەرمانبەرەیە بۆ چاودێری كردنی سەربازانی دوژمن و سەرپەرشتی كردنی زەوی و زار ئەركی پێدەدرێت. |
| قوماندان | قوماندان سەرۆک یاخود بەرپرسی ئەفسەر دەکات، وەکو قوماندانی تابور، قوماندانی لەشکر، قوماندانی ئاڵای، قوماندانی ژاندارمە. |
| قۆناغ (قوناغ) | قۆناغ واتە مەنزل، لە رێگا بۆ گەشتیاران و کاروانچیان دروست دەکرا، تا تێدا بحەسێنەوە و بخەون، هەروەها بۆ دەستنیشانکردنی دووری شوێنێک دەیانووت سێ قۆناغ یاخود چوار قۆناغ دوورە، واتە چەند قۆناغ لە نێوان ئەو دوو ناوچەیە هەبووایە هەژمار دەکرا، جگە لەوە بە کۆشکی پاشا و گەورەکان دەوترا قۆناغ یا قۆناق. فەرمانگەی حکوومەتیش پێی وتراوە قۆناغ وەکو قۆناغی حکومەت، کە هۆبەیەک لە هۆبەکانی فەرمانگەی فەرمی حکومەت پێی دەوترا قۆناغی حکومەت. |
| قیە | بە مانای زەوییەکی تەخت دێت، ئەو زەوییە بۆ چاندنی خورما و گەنم بەکارهاتووە. |
| کەتهودا (کتهودا) | واتە خزمەتکار ئەوانەی بە پلە لە فەرمانبەر پلەکەیان نزمتر بوو، پێیان دەوترا خزمەتکار. |
| کەلەك (کلك) | ئەو پارچە دارانەن کە بە ئاو ئەستوور کراون و یەك لە دوای یەك لە پاڵ یەکتر بە داو بەیەکتریەوە بەستراونەتەوە و تەختەیەکیان لێ پێکهێنراوە، ئەمەش بۆ گواستنەوەی مرۆڤ و کەلوپەل لە رووبارەکانی جەزیرە بە تایبەتی لە دیجلە بەکار هاتووە، ئەم کەلەکە بە گوێرەی گەورەییەکەی بۆ بەرێوەبردنی ٢ تا ٦ پیاوی پێویستە. دوای تەواو بوونی گەشتەکە بە تایبەتی لە سەر رووباری دیجلە تا دەگاتە بەغداد بەشی دارەکانی کەلەکەکە زۆر جار بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشرا، هەروەها قازانجی راستەقینەی کەلەکچیەکان لەو کرێیە پێك هاتبوو کە لە کاروانچیەکان وەریاندەگرت. ئەو کەلەکچیانە لەسەر رووباری دیجلە تا خوارەوە کەرستەی بیناکاری و دانەوێلە و باری گرانیشیان بار دەکرد. لە جەنگی جیهانی یەکەم سەربازیشیان پێ گوازراوەتەوە. |
| کیل | کیلە، بۆ پێوانی دانەوێلە بەکارهاتووە. |
| مەشروتیەت (مشروطیت) | مەشروت واتە مەرجدار کە پەیوەستە بە مەرجەکانەوە، مەشروتە واتە لەلایەن یەکەم خاوەنیەوە بە مەرجی نەفرۆشتن بۆ میراتگرەکانی بەجێی هێشتووە، ئەویش وەکو خانوو، زەوی کشتوکاڵی، نەخۆشخانە، مزگەوت، هەرچی مەشروتیەتە ئەوا ئەو حوکمدارە دەگرێتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆکایەتیە. |
| مەمالیکی مەحروسەی شاهانە (ممالیکی محروسە شاهانە) | وڵاتی عوسمانی. |
| مەمالیك (ممالك) | وڵاتەکان، مەملەکەتەکان، خاکی وڵاتێك. |

| مەملوک (مملوک) | کەسێک پارەی هەبێت، یاخود بەندە، کۆیلە. |
| --- | --- |
| مەنزل | لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبیە، بە زۆر مانا دێت، ئەوەی لە زمانی عوسمانیدا پێویستە بە مانای کۆشک، شوێنی کوشک، سەرە ڕێگای یەک رۆژ دێت، یاخود بە مانای دووری نێوان دوو کۆشک دەکات، تاتارەکان لە کاتی بردنی پۆستە بۆ ناوچەکانی تر، لەم مەنزیلانە هاتوونەتە خوارەوە و حەساونەتەوە، هەروەها ئەسپیان گۆریوەتەوە، یاخود شەویان لەوێ بەسەر بردووە. |
| موشیر (مشیر) | بە مانای ئاماژە پێکردن دێت، لەلایەکی تر لە چینی سەربازی لەگەڵ وەزارەت یەکسانە، کە گەورەترین پلەی سەربازیە، بۆ نموونە موشیری لەشکر، موشیری تۆپخانە. |
| موعەجەجەلە (معجلە) | موڵکی میریە و لە وەقف دیارە، هەر لە وەقف مامەڵەی بۆ دەکرێت، کە پارەکەی پێش وەختە دەدرێت. واتە بە شێوەی بەگایەتی و وەرگرتنی پارەی پێشەکی لەلایەن ئاوقافەوە دەبێت. |
| موقاتەعە (مقاطعە) | ووشەی موقاتەعە هەر لە سەرەتاوە، ئەو زەویانە بوونە کە خاوەنداریەتی بۆ دەوڵەت یاخود وەقفەکان بووە، بە کرێ دراوەتە کەسی تایبەت و دامەزراوەکان بە شێوەی ڕێککەوتن بووە، جگە لەوەش بڕی پارەکە دیاری دەکرا و ئەو پارەیەش راستەوخۆ دەچووە خەزینەی دەوڵەت. |
| میعمارباشی (معمارباشی) (سەرۆکی بیناسازی) | سەرۆکی بیناسازی، کاری سەرپەرشتکردنی بیناسازی، هەروەها لە پیشەکەی خەریکی دابەشکردن و ڕێکخستنی کارەکەی بووە. |
| نازر (ناظر) | لە بینین هاتووە، واتە سەیرکردن، کە لە هەموو شوێنێک ئامادە و سەیرکەرە، ئەرکەکەشی بەڕێوەبردن و بەڕێکردنی کاروبارەکانە، وەکو نازری دارایی. |
| هومایۆن (هومایون) | پاشا. |
| وەکالەتپەناهی (وکالتپناهی) | پیشەی سەدری ئەعزەم، ئەو کارەیە کە پەیوەندی بە سەدری ئەعزەمەوە هەیە، یەکسانە بە سەرۆکی بریکار. |
| یوزباشی | لە بنەرەتدا بە مانای ١٠٠ کەس دێت، لە رووی سەربازییەوە ئەو ئەفسەرە دەگرێتەوە کە فۆماندانیەتی یەک بلۆک سەرباز دەکات لە ١٠٠ سەرباز پێکهاتوون، بۆ نموونە یوزباشی سوارە، یوزباشی پیادە، یوزباشی ژاندارمە، یوزباشی رەدیف. |
| یوک | یوک بە مانای بار دێت، هەڵگرتنی بار ئینجا چ لەلایەن مرۆڤەوە بێت یاخود ئاژەڵ وەکو بارگیر و ئەسپ و گوێدرێژ، لەلایەکی تر بە مانایەکی تریش دێت کە یەک یوک دەکاتە بڕی ٥٠٠ هەزار قوروش. |



| زیلحیجە 1255 | 00037.01833 | C.DH. |
|---|---|---|

هۆزەکانی مزوری و زێباری کە لە هۆزەکانی کوردن، لەگەڵ حکوومەتی عەمادییە لە بنەرەتدا بەشێکن لەو حکووومەتە، بە یارمەتی حاکمەکانیان لە ناحیەکانی موسڵ بە ناوی عەین سوفەنەی کۆنترۆڵکردۆتەوە و تێدا نیشتەجێ بوونە، لە هەمان کاتدا لە لایەنگرانی دادوەرەکانی عەمادییە، یەزیدییەکانی شێخان پێش چەند ساڵ لەگەڵ یەك بۆتە ململانێیان، کوردەکان بۆ تۆڵەسەندنەوە کۆبوونەتەوە چوونەتە سەریان، حاکمی ئەم حکومەتە، عوسمان بەگ خۆی کردۆتە خاوەنی یەزیدییەکانی شیخان، کوردەکانی ئاگادار کردۆتەوە، کوردەکان هێرشیان کردۆتە سەر یەزیدییەکان بە هۆی شەڕەوە لە کوردەکان 100 پیاو و لە یەزیدییەکانی شێخان 50 پیاو کوژراوە، دوای جیابوونەوە نامەی کوردەکان بۆ پارێزگاری کردن لە موسڵ یوسف پاشا هاتووە، داوایان کردووە یەزیدییەکانی شێخان لە شوێنی خۆیان دەربکات و تۆڵەیان لێ بکاتەوە، چونکە چەند گوندێکی کوردەکانیان سوتاندوە و یەزیدییەکان بە پاڵپشتی زوبیر خۆیان بەهێز کردووە و چەند تفەنگچیەکی لەلایەن یەزیدییەکان دامەزراندووە، بەهۆی ئەم زیانەوە کوردەکان یەکیان گرتووە و چوونەتە سەر یەزیدییەکان، شوێنەکانیان وێران و کاوڵ کردووە، دواتر لە گوندەکانی کشتوکاڵی باعشیقە کە سەر بە موسڵە، هێرشیان کراوەتە سەر و ماڵومولکیان بردراوە و شوێنەکەیان کاوڵ کردووە، لەم گوندانە نزیکەی 60 پیاو و ژنیان کوشتووە، ئەم هەواڵە گەیشتۆتە موسڵ، پارێزگاری موسڵ یوسف پاشا کەتەوادای خۆی و چەند کەسێکی دامەزراندووە و ناردویەتیە شوێنەکە، کوردەکان کە بەمەیان زانیوە رایان کردووە و چوونەتە چیاکانیان، بۆ ئەم مەبەستە داواکراوە بە پەلە سەربازەکانی حەسەن پاشای دیاربەکر و والی موسڵ و بەگی بەگانی شارەزوور ئەم دوو هۆزە بوەستێنێ و سزای خۆیان پێ بدرێت، چونکە کارە خراپەکانیان کۆتایی نایەت، بەردەوام لە گوندەکانی موسڵ خەریکی خراپەکاری و تالان و وێران کردنن.




| 4 شەوال 1268 | 00255.015707 | I.DH. |
|---|---|---|

بۆ جەنابی بەڕێزم
لـە ئەیالەتـی موسـڵ بـە ڕەفتـاری سەرکەشـانە و جانەوەرانـە سـەرپێچی لـە پارەوپولـی میـری دەکـەن، بـۆ تەمبـێ کردنـی خەڵکـی عەشـائیری ئەربەعـە سـەر بـە قـەزای زێبـار هێـزی سـەربازی لەسـەر داواکاری ئەنجوومەنـی موسـڵ کـە هاتـووە لەگـەڵ نـووسراوی قائیمقامـی روانـدز بـە یەکـەوە بـۆ وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی سـەروو پێشـکەش کـراوە، بە ئامـاژەی روس خەڵکـی عەشـائیری ئەربەعـە تەنیـا بـە هێـزی هەرەشـە دەتوانـن ملکەچ بـن، بـەم رێگەوە ئامـادەکاری کـراوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە وەڵامنامـە بـۆ جەنابـی پاشـای موتەسـەرفی موسـڵ نـووسراوە، هەروەهـا ئـەو هێـزەی بەکار دەهێنرێـت لـە سـەربازانی ناوچەکـە پێیـان ڕاگەیەنـدراوە چاکسـازی بکرێـت و پارەوپولـی میـری بەدەسـت بهێنـن، لەبـەر ئـەوە خەرجـی زۆر پێویسـت لـە خەزینـە وەسـتاوە و چۆنیەتیشـی بـە نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە ڕاگەیەنـدراوە، بـە هەمـوو شـێوەیەك ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی پاشـایە، ئـەو چ بفەرمووێـت بـە گوێـرەی ئـەوە جولـە دەکرێـت.
لە 4 شەوال 1268


I.DH 259/16011

1

İ.DH.00259

| 15 شەوال 1268 | 00259.016011 | I.DH. |
|---|---|---|
| لە ناو ئەیالەتی موسڵ قەزای زێبار دانیشتووانی لە کوردی هۆزەکان و لە بنەچەکی چیایی پێکهاتوون، لەسەر کاری چەتەیی جۆرەها کاری پیس ئەنجام دەدەن، هەروەها ئەو هەموو ساڵە دیاریکراوە پارەی میری لەلایەن ئەوانەوە کەڵەکەبووە و سەرپێچی دەکەن, لەم بارەیەوە ئامۆژگاری قەبوڵ ناکەن و قسە وەرناگرن، بە گوێرەی زانیاری ئەو رۆژانە ئەو سەربازانەی بۆ لایەنی قەزای ناوبراو رۆیشتوون، کە گەیشتوونەتە شوێنەکە دانیشتووانی ناحیەکانی شێروان و شەمدینان و برادۆست و مزوری بە کۆمەڵ بەڵێنیان بە میری داوە، تەنیا دانیشتووانی ناحیەی گەردی, میری هۆزەکەیان یەحیا بەگ, ملکەچی خۆی رانەگەیاندووە، بەردەوام و دووبارە لەم بارەیەوە ئامۆژگاری کراوە، بەڵام میری ناوبراو قەبوڵی نەکردووە، تەنیا سەربازانی ناوهاتوو کە لە گوندی کلکە رۆیشتوون، بۆ گوندی شاهنشی میری ناوبراو ٥٠٠ کەسی لە چواردەوری خۆی کۆکردۆتەوە، هێرشیان کردۆتە سەر سەربازەکان، سەربازەکانیش بە ناچاری رووبەروویان بوونەتەوە بۆ ماوەی نیو کاتژمێر شەڕ و جەنگ روویداوە، لە فەرمانبەران یەکی مردووە و سێ کەسیش برینداربووە، لە چەتەکانیش دوو کەس مردوون, بە هۆی هیلاك بوون چەتەکان نەیانتوانیوە لە شەڕکردن بەردەوام بن, هەموویان بە دۆراوی چوونەتەوە گوندەکانی خۆیان، یەحیا بەگیش کە چاودێری کراوە ملکەچی خۆی راگەیاندووە، هۆزەکەش بۆ میری ملکەچی خۆیان راگەیاندووە، لەلایەن فەرمانبەری ناوهاتووەوە ئاماژەی پێکراوە، تا ئێستاش لە بارەی داهاتەکە، زیاتر لە ١٠٠ هەزار ئاقچە بۆ سندوقی دارایی موسڵ رۆیشتووە، لە سایەی جەنابی شاهانە دوای تێپەربوونی رۆژ لە دوای رۆژ کێشەکە بە ئاسانی کۆتایی هات و حاڵی حازر شەروئاژاوە رووی نەداوە، داواکاری بۆ بەندەمان نووسراوەتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٥ شەوال ١٢٦٨. | | |


OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI

İ.DH 260/16134

İ.DH.00260

| 15 موحەررەم 1269 | 00260.016134 | I.DH. |
|---|---|---|

بۆ جەنابی بەڕێزم

هاوپێچ لە داواکاری ئەنجوومەنی موسڵ, لەلایەن جەنابی محەمەد پاشا نووسراو هاتووە، لەسەر فەرموودەی جەنابی پاشا ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە گوێرەی ئاماژە و ڕاگەیەندراوەکان زێبار و دەورووبەری کە سەر بە موسڵە، داواکاری میری لەسەر دانیشتووانەکەیەتی، لە ژێر کاریگەری هێزی بە زۆرەملێ بری داواکاریەکە دەست کەوتووە، هەروەها ٥٠٠ کیسەش بۆ دواتر بەجێ هێڵدراوە و مۆڵەتیان پێدراوە دواتر بیدەن، هەروەها پێویست ناکات هۆکاری ئاوا بدرێتە دەستەوە، تا مامەڵەی توندوتیژیان لەگەڵ بکرێت و ڕێگە خۆش بکرێت دانیشتووانەکەی مەیلیان بۆ لایەکی تر بڕوات، بە ئاماژەی والی ناوبراو و موتەسەرفی موسڵ حیلمی پاشا کارەکە چارەسەر دەکرێت، بۆ بابەتی دواخستنەکەش پێویستە نەزارەتی دارایی جەلیلە ئاگادار بکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش جەنابی مولکدار ئەمر و فەرمانی چی بێت بە گوێرەی ئەوە کارەکە دەکرێت.

لە ١٥ موحەررەم ١٢٦٩




مالیه نظارتنه



| 18 ڕەمەزان | 00150.00037 | A.MKT.NZD. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی
لە ئەیالەتی موسڵ قەزای زێبار دانیشتووانی ناحیەکانی پرادۆست و گەردی و شێروان و شەمدینان و مزوری باڵا، باجی ساڵانی کۆن لەگەڵ ئەوانەی ماونەتەوە کەڵەکەبوونە، بۆ وەرگرتنی ئەو داهاتانە بە شێوەیەکی کاتی مۆڵەت دراوە بەکار بهێنرێت، بۆ تاکەکان یەك یوك و ٣٠٠٠ قوروش مووچە ڕێکخراوە لە بارەی جێبەجێ کردنی لە خەزینە لەگەڵ ڕاپۆرتی گشتگیری ئەنجوومەنی ژمێریاری داواکاری دارایی دراوەتە ئەنجوومەنی والا، ئەو مووچەیەی کە دەدرێتە ئەو کەسانە، بە گوێرەی نیزامی خەزینە جێبەجێ کردنی دژی یەکترە، ئەو ئاقچەی پێیان دەدرێت زیاترە، ئەو کەسانەی ئەو ماوەیەی بە کارەکە هەڵدەستن، ئەو ئاقچانەی دەستیان دەکەوێت، پێویستە بزانرێت برەکەی چەندە، بۆ بەدواداچوونی تۆمارکراوەکە لەم بارەیەوە نووسراو بۆ سەروو کراوە، ڕاپۆرتی ناوبراو و داواکاریەکە بە هاوپێچ نێردراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.




| MVL. | 00353.00098 | 6 زیلحیجە 1273 |
|---|---|---|

بڕیارنامە
لە ٦ زیلحیجە ١٢٧٣
ئەو ڕاپۆرتەی لە نەزارەتی دارایی لە مێژووی ١٤ زیلقەعدە ١٢٧٣ دراوەتە ئەنجوومەنی واڵا، ڕاگەیەندراوە و مۆڵەت دراوە، لە قەزاکانی ئەیالەتی موسڵ قەزای زێبار بە مووچەی ٥٠٠ قوروش بە فەرمانی پاشا ڕێگە دراوە، کاتبی بەڕێوەبەر بە هەڵبژاردن ناو و مانگانەی ئاماژەی پێ بکرێت، لە وەڵامی بڕیارنامەی سامی ئەو بڕیارنامەی لە ئەنجوومەنی ناوەخۆ هاتووە، قەزای ناوهاتوو دانیشتووانەکەی کوردن، ئەو کاتیبەی کە دەبێت لەوێ بێت پێویستە هەم زمانی تورکی هەم زمانی کوردی بزانێت، هەروەها لە کاتیبەکانیش یوسف ئەفەندی ئاشنای ئەو زمانانەیە، هەر لە سەرەتای ساڵی ١٢٧٢ تشرینی دووەم بە بڕێك مووچەی دیاریکراو کاتیبی ناوهاتوو هەروەها لە ئەیالەتی ناوبراو چەند ساڵێکە کاتیب محەمەد ئەفەندی بە مووچەی ٣٠٠ قوروش لە قەسەبە دامەزراندنی کۆتایی پێ هاتووە، بەم شێوەیە مۆڵەت نیشان دراوە کە مووچەکانیان بە باجی دانیشتووان دابین بکرێت و ناوبراوان یوسف ئەفەندی لە مێژووی دیاریکراو و محەمەد ئەفەندی بە نووسراوی ڕۆیشتووی زیادەی ئەرکەکەی لە ماوەی دەست بەکاربوونیەوە بە مووچەی دیاری کراوی باسکراودا لە ئەرکی کاتیب دەست بە کار بن، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە لە نەزارەتی ناوهاتوو حەواڵە کراوە و لە ئەنجوومەنی واڵا نووسراوی بۆ کراوە.






A.}MKT.UM.00306.00037.001

| 18 جەمادی کۆتایی 1274 | 00306.00037 | A.MKT.UM. |
|---|---|---|
| لە مێژووی ١٨ جەمادی کۆتایی ١٢٧٤ نووسراو بۆ موسڵ نێردراوە<br>نووسراوەکانی مۆر کراوە<br>لە سەربازی نیزامیەی شاهانە بە بینباشی خانەنشین کراوە، لەبەر بەڕێوەبەرایەتیکردنی قەزای زێبار بۆ چۆنیەتی مووچەکەی لەسەر عەسکەر نووسراو کراوە، پارچە ١<br>نووسراوی بە مۆر، پارچە ٣ | | |




<table dir="rtl">
<tr><td>I.DH.</td><td>00388.025653</td><td>3 سەفەر 1274</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی دەوڵەت<br>لـە ئەیالەتـی حەلـەب لـەو قەزایانـەی کـە ناویـان دیاریکـراوە، لـە ئەیالەتـی موسـڵیش لـە سـانجەقی زێبـار و سـانجەقی چەلـدر، قەزاکانـی ئەردەهـان و سـانجەقی ئایـدن داهاتـی دە یـەك (عـشر) و رسـوماتی جۆراجـۆر کراوەتـە راپـۆرت و لەگـەڵ شـوێنگرەوە (بـدل) حەواڵـەی داواکارەکان کـراوە، بـۆ ئـەوەی رابگەیەندرێـت و پێشـکەش بکرێـت لـە نەزارەتـی دارایـی جەلیلـە چـوار پارچـە نـووسراو بەیەکـەوە لەگـەڵ پوختەکانیـان بەیەکـەوە بـۆ جەنابـی ملوکانـە نێـردراوە، لـە بـارەی حەواڵـەی داهاتـی ناوهاتـوو بـە راپـۆرت پێشـکەشـی نەزارەتـی ناوهاتـوو دەکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە جەنابـی شاهنشـاهی لـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت، بـە گوێـرەی ئـەوە دەسـت بـە کار دەکرێـت، لـە ٣ سـەفەر ١٢٧٤.</td></tr>
</table>



I.MVL.407/17684

I.MVL.00407

| 25 رەبیعی کۆتایی 1275 | 00407.017684 | I.MVL. |
|---|---|---|

ئەو راپۆرتەی لە مێژووی ١٠ رەبیعی یەکەم ١٢٧٥ لە نەزارەتی دارایی جەلیلە دراوەتە ئەنجوومەنی والا راگەیەندراوە و رەزامەندی دراوە لە ناو ئەیالەتی موسڵ قەزای زێبار بۆ چاکسازی کردنی بارودۆخەکەی و بۆ دەست هێنانەوەی پارەوپولی کۆن و نوێی، سەرکردە عەزیز ئاغا و عارس ئاغا بە شێوەیەکی کاتی بە هاوکاری برێکی دیاریکراو لە کەسی جۆراوجۆر ئەرکیان پێ دەسپێردرێت و بۆ ئەم مەبەستەش ٦٠٠٠ قوروش مووچەیان بۆ دەبردرێتەوە، هەروەها بۆ کەسانی ناوهاتوو ئەو مۆڵەتەی پێیان دەدرێت ئاشکرا و روونە، بە راپۆرتێك باس کراوە و بۆ جێبەجێ کردنی لە نەزارەتی ناوهاتوو حەوالەی ئەنجوومەنی والا کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٢٥ رەبیعی کۆتایی ١٢٧٥




<table>
<tr><td>MVL.</td><td>00751.00074</td><td>23 رەبیعی یەکەم 1275</td></tr>
<tr><td colspan="3">داواکاری<br>٤١٢<br>لە ١٦ رەبیعی یەکەم ١٢٧٥<br>ئەو راپۆرەتەی لە ١٠ رەبیعی یەکەم ١٢٧٥ لە نەزارەتی دارایی جەلیلە دراوەتە ئەنجوومەنی والا، راگەیەندراوە و رەزامەندی دراوە، لە ئەیالەتی موسڵ قەزای زێبار بەهۆی چاکسازی بارودۆخەکەی و دەستکەوتنی پارەوپولی کۆن و نوێ، سەرکردە عەزیز ئاغا و عارس ئاغا بە هاوکاری کەسانێکی دیاریکراو لە کەسانی جۆراوجۆر، ٦٠٠٠ قوروش مووچەیان بۆ براوەتەوە، بۆ جێبەجێ کردنی لە شوێن خۆی کۆتایی پێ هاتووە، هەروەها بۆ کەسانی ناوهاتوو مۆڵەت دراوە, بە ئاشکرا بری پارەی دیاریکراو لەگەڵ راپۆرتێکی نووسراو لە نەزارەتی ناوهاتوو حەواڵەی ئەنجوومەنی والا کراوە تا جێبەجێ بکرێت.</td></tr>
</table>

I.MVL.00433

| 15 زیلحیجە 1276 | 00433.019095 | I.MVL. |
|---|---|---|

راگەیەندراوی بەندەتانە

بەڕێوەبەری قەزای زێبار، خەلیل بەگ نووسین و خوێندنەوەی نییە، لە زمانی خۆی زیاتر ئاشنای زمانێکی تر نییە، ناوبراو تەنیا زمانی تورکی دەزانێ، لەبەر ئەوەی زمانی تر نازانێ، بۆیە لە شوێنەکەشی ناگونجێت، لەگەڵ دەست بەکاربوونی لە کاروبار و چاکسازیەکانیەوە تا ئەمرۆ هیچ شتێکی سەرکەوتووی نەبووە، ئەگەر ئێستا بە پێویست نەزانراوە کە بگۆردرێت و دووربخرێتەوە، ئەوا لەبەر گرنگی شوێنەکە ناوبراو دووربخرێتەوە و لە شوێن ئەو کەسێکی ئاشنا و کەسێکی بە ئەزموون دابمەزرێت، لە قاپوچی باشی ریکابی هومایۆنی شاهانە و ئەندامی ئەنجوومەنی لێکۆڵینەوە، عەبدولرەحمان بەگ زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی دەزانێت و هەر خۆشی کەسێکی لێهاتووە، بۆ کاری بەڕێوەبەرایەتی کەسێکی بە توانایە، هەرچی خەلیل بەگیشە ئەوا تا ئێستا هیچی نەبینراوە، بەڕێوەبەری ناحیەی تەلەعفەر حەسەن ئەفەندی هێشتا لەگەڵ دانیشتووانەکەی رانەهاتووە، بۆیە بگۆردرێت، عەبدولرەحمان بەگ بە مووچەی ئێستای کە ١٢٥٠ قوروش لە سەرەتای مایسی ساڵی ١٢٧٦ بە بەڕێوەبەری قەزای زێبار دەست بەکار بێت و خەلیل بەگیش بە مووچەی ١٠٠٠ قوروش وەکو بەڕێوەبەری تەلەعفەر دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ئەنجوومەنی گەورە لە کاتی دەنگدان جێبەجێ کراوە، بە نووسراو بۆ خەزینە نێردراوە لە مێژووی ناوهاتووەوە وێنەی مووچەکانیان پەسەند کراوە و نووسراویان بۆ کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٣ شەوال ١٢٧٦.


İ.DH.00796

| I.DH. | 00796.064582 | 2 موحەڕرەم 1297 |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی دەوڵەت
لە ویلایەتی موسڵ بە گوێرەی ئەو ئاماژەی کراوە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردن چۆتە قەڵەم، لەگەڵ هاوپێچەکەی لە کاغەزی وەرگێردراو بەیەکەوە پێشکەش کراوە، دوو پارچە داواکاری بە شێوەیەکی ئاشکرا نووسراوە، لە ناو سانجەقی موسڵە، لەبەر پەرێشانی و ڕەزیل بوونیەوە بۆ دوو بەش، بەش کراوە، ناحیەی زێبار بەهۆی گرنگی شوێنەکەی دانانی قائیمقامیەتێك بۆ قائیمقام و فەرمانبەر و کارگێریەکەی پێویستی بە داهاتە، ٣٢٨٠ قوروش لە موازەنەی ساڵی ١٢٩٥ نووسراوەتەوە، ڕێکخستنی لە ژێر فەرمانی پاشا بووە، هەروەها ئەمجارە ناحیەی ناوهاتوو لەبەر ڕووداوی شێخ عوبیدوڵڵا ئەفەندی قاتێکی تر گرنگیەکەی زیادی کردووە، قەزای ناوهاتوو بەپەلە ڕێکخستنی کارگێری بۆ بکرێت، ئەوەی ناوی هاتووە بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار لە میرەکانی جاف بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەی سەرچنار محەمەد بەگ لە داهاتی باسکراو بە مووچەی ١٤٠٠ قوروش دادەمەزرێت، بە بریاری پێشوو داهاتی باس کراو لە موازەنەی ئەم ساڵەی باسکراوە تۆمار بکرێت، هەروەها ڕێکبخرێت و پێی بدرێت، لە ٢ موحەڕرەم ١٢٩٧.


OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2153 | 9 | 2

ŞD.02153.00009.002

<table dir="rtl">
<tr><td>ŞD.</td><td>02153.00009</td><td>1 رەبیعی یەکەم 1298</td></tr>
<tr><td colspan="3">ژمارە ٢٧<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>مستەفا ئاغا زێباری مردووە قۆناغەکەی لەلایەن کورەکەی بە ٢٠ هەزار قوروش فرۆشراوە، ناوبراوی کۆچکردوو قەرزاری میریە، بۆیە ئەو برە پارەیە بۆ میری هەژمار کراوە، هەروەها ئەو شوێنانەی کە پێویستیان بە نۆژەنکردنەوەیە، بە ٤ هەزار قوروش نۆژەن دەکرێتەوە، لەبەر ئەوەی بردنی قۆناغی حکوومەت لەلایەن دەستەی قەزای زێبار پێویستی بە مۆڵەتە، بۆ ئەم مەبەستە داواکاری لە مێژووی ٢١ شەوال ١٢٩٧ ژمارە ١٢ پێشکەش کراوە، هێشتا وەڵامی سەروو نەهاتووە، ئەو بابەتەش لە شوێن خۆی بەردەوام دووپات دەکرێتەوە، بۆیە بوێری کراوە کە دووبارە داوای مۆڵەتی نەزارەتپەناهی کراوەتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١ رەبیعی یەکەم ١٢٩٨ و لە ٢٠ کانوونی دووەم ١٢٩٦.<br>محەمەد مونی بریکاری والی موسڵ</td></tr>
</table>



İ.DH.00856

| 3 رەجەب 1299 | 00856.068610 | I.DH. |
|---|---|---|
| لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای زێبار محەمەد بەگ بە گوێرەی پێویست لە چینی پێنجەم بۆ قائیمقامیەتی عەقرە هەروەها قائیمقامی عەقرەش عەبدولرەزاق ئەفەندی هەروەکو ئەو لە چینی سێیەم بۆ قائیمقامیەتی زێبار گۆرینەوەی شوێنەکانیان کراوە، هەروەها کاغەزی وەرگێراوی محەمەد بەگ پێشکەش کراوە، پەسەندکردنی گۆرینەوەی شوێنی ئەرکەکەیان لە ویلایەتی موسڵ پێشکەش کراوە و حەواڵەی قۆمیسیۆن کراوە، داواکاری لە سەرەتای موحەررەم ١٢٩٩ ژمارە ٩ راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، لەگەڵ مووچەی دیاریکراویان پەسەند کراوە، هاوپێچ لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراو پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٣ رەجەب ١٢٩٩ و ٨ مایس ١٢٩٨. | | |

تلغراف نامه



Y.PRK.ASK.00016.00027.001

| 30 ڕەبیعی یەکەم 1300 | 00016.00027 | Y.PRK.ASK. |
|---|---|---|

وێنـەی ئـەو تەلەگرافنامەیـە کـە لە سـەر عەسـکەرەوە لە ژێر موشـیرەتی لەشـکری هومایۆنی شەشـەم هاتووە لـە قـەزای زێبـار بـۆ چاکسـازی کردنـی ئـەو کارە نەگونجاوانەی سـەری هەڵداوە و بـۆ گەڕانەوەی سـەقامگیری ئاسایشـی ناوچەکـە، لـە موتەسـەرفیەتی موسـڵ داواکـراوە و تێروانینـی ئـەوە کـراوە کـە پێویسـتی بـە پەلـە کردنـە، بۆیـە لـە قوماندانیـەت فەرمـان دراوە دوو بلـۆك سـەربازی نیزامیـە بنێردرێـت، وەکـو زانیـاری ڕاگەیەنـدراوە، لـە ٢٧ کانوونـی دووەم ١٢٩٨.



İ.DH.00868



İ.DH.00868

| I.DH. | 00868.069406 | 21 موحەڕرەم 1300 |
|---|---|---|

- لـە سـانجەقی موسـڵ عەبدولـڕەزاق ئەفەنـدی قائیمقامـی قـەزای زێبـار حەواڵـەی قائیمقامیەتـی سـنجار کـرا، شـوێنی قائیمقامیەتـی زێباریـش بەتـاڵ دەمێنێتـەوە، بۆیـە قائیمقامی پێشـووی دهـۆك، محەمەد نەجیـب ئەفەنـدی دامەزرا، نـوسراو لە مێـژووی ١٤ ڕەجـەب ١٢٩٩ ژمـارە ٩ لـە بریـکاری ویلایەتـی موسـڵ حەواڵـەی قۆمیسـیۆن بـوو، هـەر چەنـدە ئاماژەی پێکـراوە، بـەڵام ناوبـراو نەجیـب ئەفەنـدی لـە قۆمیسـیۆن کەسـێکی گونجـاو نییـە، بۆیـە پەسـەندکردنی لـە ئەرکـی فەرمانبەرایەتـی بـە ڕێنمایـی نـوێ بڕیارێکـی گونجـاو نییـە، بـۆ ئـەم کارە دەرویـش ئەفەنـدی لـە قائیمقامیەتـی خوبـە جیابۆتـەوە و لە چینی سـێیەم هەڵبژێـردراوە، سـەرەتا لـە قائیمقامیەتـی قـەزای قـزل کلیسـا بـە فەرمانـی پاشـا دانـراوە، بـەڵام بەهـۆی هەندێـك هـۆکار داوا کـراوە بگوازرێتـەوە بـۆ لایەکـەی تـر و بگۆردرێتـەوە، بۆیـە دامەزراندنـی ناوبـراو گونجـاوە، هەروەهـا وەرگێرانی کاغـەزی ناوبراو لەگـەڵ نـووسراوی هاوپێـچ بـە دووبارەکردنـەوەی بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، هـەر کـە لەسـەرەوە ڕەزامەنـدی درا جێبەجـێ دەکرێـت، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.

لە ٢ موحەڕرەم ١٣٠٠ و لە ١ تشرینی دووەم ١٢٩٨

- بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

ڕاگەیەندراوی بەندەتانە

ئەمجـارە لـە ویلایەتـی موسـڵی جەلیلـە و قائیمقامیەتـی قـەزای زێبـار دامـەزراوم، بـە گوێـرەی نیـزام پێویسـتە خەرجـی ڕێـگام بـۆ دابیـن بکرێـت، لـە هـەر حاڵەتێکـدا ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢١ موحـەڕرەم ١٣٠٠ و ١٩ تشریـنـی دووەم ١٢٩٨.

دەرویش قائیمقامی قەزای زێبار


باب عالی
دائرۀ داخلیه
عدد ١٤٦٧

İ.DH 1114/87141

3

İ.DH.01114

| I.DH. | 01114.087141 | 18 رەبیعی کۆتایی 1306 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
ژمارە ١٤٦٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەتانە
دەرویش ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای زێبار لە کاروباری ئەرکەکەی دا لەبەر ئەوەی کارەکانی لەسەرخۆ رایی دەکات، دوور دەخرێتەوە و لە شوێن ئەو قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەلی رزا ئەفەندی دەگوازرێتەوە، هەروەها لە شوێن ئەویش جەمال ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم هەروەها لە قائیمقامیەت دوور خراوەتەوە دادەمەزرێت، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە، بریارنامەش لە قومیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە، لەگەڵ کاغەزی وەرگێردراوی پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی دراوەتە جەنابی خەلافەتپەناهی، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٨ رەبیعی کۆتایی ١٣٠٦ و لە ١٠ کانوونی یەکەم ١٣٠٤
نازری کاروباری ناوەخۆ



| 1306 شەعبان 7 | 01130.088236 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
بۆ جەنابی دەوڵەت
لە ناو ویلایەتی موسڵ بەهۆی مردنی عەلی رزا قائیمقامی قەزای زێبار، لە شوێن ئەو قائیمقامی شەتره نەشئەت ئەفەندی بنێردرێت، لە شوێن ئەویش قەدری ئەفەندی هەڵبژێردراو لە چینی سێیەم لە بەرێوەبەرایەتی بدعە دوور خراوەتەوە لە بارەی دامەزراندنیەوە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بریارنامە دراوە، هەروەها کاغەزی کەسێتی وەرگێردراو هاوپێچ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا چ بفەرموویەت جێبەجێ دەکرێت، لە ٧ شەعبان ١٣٠٦ لە ٢٧ مارت ١٣٠٥.

سەدری ئەعزەم



| 18 ڕەبیعی کۆتایی 1306 | 01577.00040 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٨ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٠٦
دەرویش ئەفەندی قائیمقامیەتی قەزای زێبار بەهۆی تەمبەڵی و بێ دەسەڵاتیەوە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەلی ئەفەندی بۆ ئەوێ بگوازرێتەوە، لە شوێن ئەویش لە چینی سێیەم هەڵبژێردراو لە قائیمقامیەتی فۆدینە جەمال ئەفەندی دوورخراوە دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە ئەو داواکاریەی کە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران ڕێکخراوە لەگەڵ کاغەزی وەرگێرانەکەی بەیەکەوە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن.




DH.MKT.01595.00042.001

| DH.MKT. | 01595.00042 | 16 جەمادی کۆتایی 1306 |
|---|---|---|

قائیمقامـی زێبـار عەلـی رزا ئەفەندی بەهـۆی مردنیـەوە، خانەوادەکـەی داوای برینەوەی مووچەیـەك دەکەن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە داواکاری پزیشکەشـی ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی بۆلـۆ کـراوە، ئـەو داواکاریـە لەگەڵ خشـتەی مـاوەی خزمەتـی رێکخـراوە و حەواڵـەی نەزارەتـی سـندوقی خانەنشـینی جەلیلـە کـراوە، ئەگەرچـی لـە نووسراوەکـە دیاریکـراوە و راگەیەنـدراوە، بـەڵام هـەر لەگـەڵ مردنـی ناوبـراو لێـرە بـۆ یـەك رۆژیـش بێـت زانیاریەکانـی تۆمـار نەکـراوە، بۆیـە پەلـە بکرێـت لـە ناردنـی مێـژووی کۆچکردنەکەی، بـۆ ئەم مەبەسـتە ئەمر و ئـاگاداری دراوەتـە ویلایەتـی موسـڵ، فەرمانـی سـەروو بـۆ جەنابـی نەزارەتپەناهیـە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٦ جەمـادی کۆتایـی ١٣٠٦ و لـە ٤ شـوبات ١٣٠٤.






DH.MKT.01597.00068.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01597.00068</td><td>20 جەمادی کۆتایی 1306</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٠ جەمادی کۆتایی ١٣٠٦<br>٩ شوبات ١٣٠٤<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>قائیمقامی قەزای زێبار عەلی رزا ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە، خانەوادەکەی بۆ برینەوەی مووچە لە سەر داواکاری ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی بۆلۆ، نەزارەتی سندوقی خانەنشینی جەلیلە ئاماژەی پێکراوە، ناوبراو بەهۆی مردنیەوە بۆ رۆژێك تۆمار و زانیاری نەبووە، مێژووی مردنەکەی بە پەلە رەوانی والا بکرێت، بە نووسراو لە جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.01611.00030.001

| DH.MKT. | 01600.00030 | 17 ڕەجەب 1306 |
|---|---|---|

١٧ ڕەجەب ١٣٠٦
١٨ مارت ١٣٠٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
بەهۆی کۆچی دوایی قائیمقامی زێبار عەلی ڕزا ئەفەندی، لە شوێن ئەو قائیمقامی شەترە، نەشئەت ئەفەندی دابنرێت و بگوازرێتەوە، هەروەها لە شوێن ئەویش لە چینی سێیەم قەدری ئەفەندی کە هەڵبژێردراوە و لە بەڕێوەبەرایەتی ........ جیابۆتەوە، دابمەزرێت. ئەو داواکاریەی دراوەتە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران، هاوپێچ لەگەڵ کاغەزی وەرگێراوی ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن و وەرگرتنی ڕەزامەندی جەنابی فەخامەتپەناهیە.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

DH.MKT.01617.00119.001

| DH.MKT. | 01617.00119 | 8 شەعبان 1306 |
|---|---|---|

٨ نیسان ١٣٠٥
تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی بەسرە و موسڵ
قائیمقامی شـەترە، نەشـئەت ئەفەنـدی بگوازرێتـەوە بـۆ قائیمقامیەتـی زێبـار، لـە شـوێن ئەویـش قـەدری ئەفەنـدی دابمەزرێـت، لـە مێـژووی ٨ شـەعبان ١٣٠٦ فەرمانـی پاشـای لەسـەر دراوە.




| DH.MKT. | 01617.00122 | 19 شەعبان 1306 |
|---|---|---|
| لە گواستنەوەی تاهیر ئەفەندی بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار پاشگەزبوونەتەوە و لە شوێن ئەو قائیمقامی شەترە، نەشئەت ئەفەندی دەگوازرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە داواکاری پێشکەشی قۆمیسیۆن کراوە، لەسەر ئەوەش فەرمانی پاشا دەرچووە، لە ١٠ شەعبان ١٣٠٦ بە گوێرەی نووسراوی سەدری ئەعزەمی سەدارەت لە ئەرکەکەی دادەنرێت.<br>لە مێژووی ٨ نیسان ١٣٠٧ بە تەلەگراف موسڵ ئاگادار کراوەتەوە | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
1620 | 87

| DH.MKT. | 01620.00087 | 29 شەعبان 1306 |
|---|---|---|

٢٩ شەعبان ١٣٠٦
١٨ نیسان ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە سانجەقی مونتەفیك قائیمقامی قەزای شەترە، بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار دادەمەزرێت و سەرەتا بە تەلەگراف ئاماژەی پێکراوە، کاتێك نەشئەت ئەفەندی دەگاتە شوێنی کارەکەی و دەست بە کارەکەی دەکات لەگەڵ مێژووی دەست بەکار بوونی بە شێوەیەکی تۆمارکراو مانگانە ١٢٥٠ قوروش وەکو مووچە بۆی بڕێتەوە، بۆ ئەمەش تۆماری ڕێکخراوە، بۆ جێبەجێ کردنەکەشی ئاماژە بۆ سەروو نێردراوە و لە نەزارەتی ژمێریاریش ڕاگەیەندراوەکە باسکراوە، بۆ جێبەجێ کردن هیممەت بکرێت.



| 8 رەمەزان 1306 | 01622.00004 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بۆ برینەوەی مووچە بۆ خێزانەکەی لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەق بە داواکاری ئاماژەی پێکراوە، لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای زێبار، کۆچکردوو عەلی رزا ئەفەندی لە سەرەتای خزمەتی بۆ دەوڵەت لە تەمەنی چەند دەستی پێکرد و لە چ مێژووییەك کۆتایی پێ هات تا مردنی، مێژووی دەست کردن بە ئەرکەکانی هەر یەك لەمانە بە مێژوو دیاری کراوە و هۆکاری دوور خستنەوەی هەروەها ئەو مووچەی وەریگرتووە لەگەڵ برەکەی دیاری کراوە، بە گوێرەی رێکخستنی ماوەکەی لە خشتە دیاریکراوە، لەگەڵ کاغەزەکانی نێردراوە، ئەمەش لە ژمێریاری باسکراوە و لەم بارەیەوە سێ پارچە کاغەزی لولدراو لەگەڵ خشتەکە نێردراوە بۆ ئەوەی جێبەجێ بکرێت، لە ١٤ جەمادی یەکەم ١٣٠٦ و لە ٤ کانوونی دووەم ١٣٠٤.



| DH.MKT. | 01622.00060 | 9 رەمەزان 1306 |
|---|---|---|

٩ رەمەزان ١٣٠٦
٢٧ نیسان ١٣٠٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی قەزای زێبار عەلی رزا ئەفەندی بە هۆی مردنیەوە، بۆ ئەوەی لە شوێن ئەو قائیمقامی عەقرە، تاهیر بەگ دابمەزرێت نووسراو لە مێژووی ٢٨ مارت ١٣٠٥ ژمارە ١٠ هاتووە، حەواڵەی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بووە، لەبەر ئەوەی تاهیر بەگ لە هەڵبژێردراوان نییە، لە بەسرا قائیمقامی شەترە نەشئەت ئەفەندی بۆ قائیمقامیەتی زێبار بگوازرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا مۆڵەت دراوە، لەگەڵ تەلەگرافنامەی ٨ نیسان ١٣٣٥ سەروو ئاگادار کراوەتەوە، ناوبراو تاهیر بەگ لە قائیمقامیەتی عەقرە دەمێنێتەوە و نووسراو بۆ ئەم مەبەستە کراوە.



موصل ولایتنه بیورلدی


<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01641.00127</td><td>25 زيلحيجه 1306</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٥ زيلحيجه ١٣٠٦<br>١١ تەمموز ١٣٠٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق جەمال ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی زێبار، نەشئەت ئەفەندی سەبارەت بە گۆڕینەوەی ئەرکەکانیان بە تەلەگراف لە ویلایەت کۆتایی پێ هاتووە، بەڵام ئەو بابەتانە لەگەڵ داواکاری ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت نێردراوە، بە گوێرەی ماددەی ٣٠ی بڕیارەکانی نیزامنامە و سەیرکردنی لەم فەرمانەدا پێویستە بە داواکاری کۆتایی پێ بێت، بە نووسراوی والاش لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی ئەرکەکان باسکراوە، بۆ ئەم کارەش هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>

DH.ŞFR.00144.00047.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00144.00047</td><td>4 زيلحيجه 1307</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بە ڕێگەی پۆستەوە روون کراوەتەوە، ئاسایش و ئەمنیەتی زێبار لەلایەن ئاغاکانەوە هەڕەشە لێکراو بوو، بەهۆی ناکۆکی و هێرشکردنە سەر یەکتر، بە پێشخستنی پاراستنی ئاسایش و ئەمنیەت، ئاسایش و ئەمنیەت مسۆگەر بوو، فەرمان راگەیەندراوە، لە ١٠ تەمموز ١٣٠٦.<br>تاهیر والی موسڵ</td></tr>
</table>




<table>
<tr><td>ŞD.</td><td>00895.00061</td><td>24 رەبیعی یەکەم 1307</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی خانەنشینی فەرمانبەران<br>ژمارە ٣٣٨١<br>لە ناو موسڵ قائیمقامی مردووی قەزای زێبار عەلی رزا ئەفەندی لەلایەن خێزانەکەی مەنشورە خانم خۆی و کچەکانی سەحرا خانم و زەکیە خانم هەروەها کورەکانی رزا ئەفەندی و زیا ئەفەندی لەسەر داواکردنیان، مووچەیان بۆ براوەتەوە، لە سانجەقی یۆلۆ بە داواکاری داواکاریەکە و خشتەی ماوەی خزمەت لەم بارەیەوە نووسراو لە ژمێریاری رێکخراوە، ژمارەکە بە کۆکردنەوەی لە پەراوێز ووردبینی بۆ کراوە.<br>مێژووەکانی ئەرکی خزمەتکردنی ناوبراو لەگەڵ ئەو مووچانەی وەریگرتووە و برەکەشی لە مێژووی مردنی لە ١ ئەیلوول ١٣٠٤ بە بریاری فەرمانبەرانی دەوڵەت پشت بەستن بە ماددەکانی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ دوای زیادکردن و کەمکردنەوە ئەوەی شایەنیانە ١٥٠ قوروشە، ئەو مووچەیە لە نێوانیان دابەش دەکرێت، هەر یەکە ٣٠ قوروشی بەر دەکەوێت، لە بارەی ئەو مووچەوە بە ماددەی ٣٥ مامەڵەکە جێبەجێ دەکرێت، نووسراو بۆ سندوقیش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٤ رەبیعی یەکەم ١٣٠٧ و لە ١١ تشرینی دووەم ١٣٠٥.</td></tr>
</table>


İ.DH.01169

| 26 جەمادی کۆتایی 1307 | 01169.091381 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
بۆ جەنابی دەوڵەت
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق، جەمال ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی قەزای زێبار، نەشئەت ئەفەندی لەسەر ئاماژەی ناوەخۆ نووسراو کراوە بۆ ئەوەی ئەرکەکەیان بگۆردرێتەوە، بریارنامە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران رێکخراوە و نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی نووسراو لە نەزارەتی ناوەخۆ رێکخراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت ئەمر و فەرمانی هومایۆنە، هەر چییەك بفەرمووێت نوسراو دەکرێت بۆ جێبەجێ کردنی، لە ٢٦ جەمادی کۆتایی ١٣٠٧ لە ٤ شوبات ١٣٠٥.
سەدری ئەعزەم



DH.MKT.01658.00116.001

| 22 موحه‌ڕره‌م 1307 | 01658.00116 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٢ موحه‌ررەم ١٣٠٧
٦ ئه‌يلوول ١٣٠٥
بۆ ويلايه‌تی موسڵ
عه‌لی رزا ئه‌فه‌ندی كه‌ قائيمقامی قه‌زای زێبار بوو دوای مردنی له‌ ساڵی ١٣٠٤، له‌ مووچه‌ی ٨٠٠ و هه‌ندێك قوروش ماوه‌ته‌وه‌، له‌ رێكخستنی بره‌ پاره‌ی ناوبراو ده‌درێته‌ ميراتگری كۆچكردووی ناوبراو، بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ داواكاری له‌ نه‌زاره‌تی دارايی جه‌ليله‌ نێردراوه‌ به‌ تكا كردن داوا كراوه‌، ئه‌و مووچه‌يه‌ی كه‌ هه‌يبووه‌، ئه‌وه‌ی ماوه‌ته‌وه‌ و كۆبۆته‌وه‌، ياخود ئه‌گه‌ر هه‌يه‌ له‌ چه‌ند قوروش پێك دێت، ئاماژه‌ی پێكراوه‌ ئه‌و مووچه‌يه‌ی كه‌ڵه‌كه‌بووه‌، بدرێته‌ ميراتگره‌كه‌ی، له‌م باره‌يه‌وه‌ سه‌روو ئاگادار كراوه‌ته‌وه‌ و له‌ نه‌زاره‌تی ژمێرياری باسكراوه‌، فه‌رمان دراوه‌ هيممه‌ت بكرێت.




DH.MKT.01696.00071.001

| 17 جەمادی کۆتایی 1307 | 01696.00071 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
١٧ جەمادی کۆتایی ١٣٠٧
٢٧ کانوونی دووەم ١٣٠٥
قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق، جەمال ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی قەزای زێبار نەشئەت ئەفەندی بۆ گۆڕینەوەی ئەرکەکانیان بە داواکاری لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، لەسەر ئەو ئاماژە پێکردنە نووسراو کراوە، داواکاریەکە بە هاوپێچ پێشکەشی قەڵەمی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران، بۆ ئەوەی جێبەجێ بکرێت.




DH.MKT.01707.00024.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>01707.00024</td><td>19 رەجەب 1307</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٩ رەجەب ١٣٠٧<br>٢٧ شوبات ١٣٠٥<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق، جەمال ئەفەندی لەگەڵ قائیمقامی قەزای زێبار، نەشئەت ئەفەندی بە تەلەگراف زانیاری دراوە بە گۆڕینەوەی ئەرکەکەیان، هەر لەگەڵ مێژووی دەست پێکردنی ئەرکەکەیان ئەوا بە گوێرەی تۆمار هەر یەکەیان مانگانە ١٢٥٠ قوروش مووچە وەردەگرن، لەوێ لەگەڵ جێبەجێ کردن بە مێژووی ناوهاتوو لەلایەنی سەروو نووسراو نووسراوەتەوە لە نەزارەتی ژمێریاری باسکراوە، فەرمان دراوە هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.01723.00070.001

| 22 ڕەمەزان 1307 | 01723.00070 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٢ ڕەمەزان ١٣٠٧
٢٩ نیسان ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی قەزای زێبار، عەلی رزا ئەفەندی مردوو، لە ساڵی ١٣٠٤ لە قەزای ناوهاتوو لە سندوقی دارایی هەقی مانگ و نیوێکی هەیە، ١٨٠٠ قوروش و هەندێك بە ڕێگەی ویلایەت لە قەزای ناوهاتوو دەهێنرێت، ئەمەش دوای ئەوەی داواکاری بە مۆر لەلایەن خێزانەکەی بە ناوی مەنشورە، بەرز کراوەتەوە و داوای کردووە، بۆ جێبەجێ کردنیشی نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە نێردراوە، بۆ خەرجکردنیشی داوای هیممەت کراوە.

İ.DH 1208/94544

İ.DH.01208

| 6 جەمادی یەکەم 1308 | 01208.094544 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
ژمارە ٥٣٢
قائیمقامی قەزای زێبار جەمال ئەفەندی کۆچی دوایی کردووە، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ دەرچووە و بە حەواڵە کردنی خوێندراوەتەوە دەرکەوتووە، عەبدوڵڵا ئەفەندی لە قائیمقامیەتی قەزای ناوبراو بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەی نیف بووە، دوای تاقیکردنەوە لە قۆمیسیۆن هەڵبژاردننامەی قائیمقامیەتی چینی سێیەمی پێ دراوە، نووسراو کراوە بە دامەزراندنی عەبدوڵڵا ئەفەندی جگە لەمەش وەرگێراوی پەسەندکراوی پێشکەش کراوە، لەگەڵ پەسەند کردنی لە جەنابی نەزارەتپەناهی جێبەجێ دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٦ جەمادی یەکەم ١٣٠٨ و لە ٦ کانوونی یەکەم ١٣٠٦.






DH.MKT.01771.00037.001

| کۆتایی سەفەر 1308 | 01771.00037 | DH.MKT. |
|---|---|---|

کۆتایی سەفەر ١٣٠٨
٢ تشرینی یەکەم ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵ
بە پێویست زانراوە لە قەزای زێبار لە قۆناغی حکوومەت بە مووچەی ٥٠ قوروش یەك ژوورەچی دابمەزرێت، لە بارەی جێبەجێ کردنی کارەکە لە مێژووی ٢٥ تەمموز ١٣٠٦ ژمارە ٣٥ نووسراو هاتووە و بە حەواڵە کردنیەوە پەراوێزی نەزارەتی ژمێریاری لەسەر نووسراوە، کە لە دەرەوەی موازەنە بە فەرمانی پاشا خەرج کردنی قەدەغەیە، نیشانی داوە کارەکە ناکرێت.






DH.MKT.01798.00129.001

| DH.MKT. | 01798.00129 | کۆتایی جەمادی یەکەم 1308 |
|---|---|---|
| کۆتایی جەمادی یەکەم ١٣٠٨<br>٣٠ کانوونی یەکەم ١٣٠٦<br>نەزارەتی دارایی جەلیلە<br>قائیمقامی پێشووی قەزای زێبار جەمال ئەفەندی مردوو بۆ ئەوەی مووچە بۆ خانەوادەکەی ببڕێتەوە، خشتەی ماوەی خزمەتی ڕێکخراوە و تۆمار کراوە، لە بارەی مێژووی ئەرکەکانی لە دانان و دوورخستنەوەی و بڕی مووچەکانی بە لێکۆڵینەوە ئاماژەی پێکراوە، بە نووسراوێکی هاوپێچ دەفتەرەکەی لە قەڵەم نێردراوە، بۆیە بەپەلە هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی. | | |





DH.MKT.01805.00105.001

| DH.MKT. | 01805.00105 | 24 جەمادی کۆتایی 1308 |
|---|---|---|

٢٤ جەمادی کۆتایی ١٣٠٨
٢٣ کانوونی دووەم ١٣٠٦
بۆ ویلایەتی موسڵ

وەکو قائیمقام لە قەزای زێبار دامەزرا، لە تەلەگرافنامەی ٢ کانوونی دووەم ١٣٠٦ فەرمان دراوە لە چینی سێیەم عەبدوڵڵا ئەفەندی لە مێژووی دەست بەکار بوونی تۆمار کراوە مانگانە ١٢٥٠ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، لە مێژووی نووسراوەوە ئەو مووچەیەی مانگانە وەریدەگرێت نیوەی بە پێی بریارنامە دەدرێتە نەزارەتی سندوقی خانەنشین، هەروەها مووچەی ناوهاتوو ١٠٪ ی بە یەك جێ دیاری کراوە دەنێردرێتە قۆمیسیۆن، بۆ خەرجی ڕێگاش ١٩٢٦ قوروش لە پارەی ناوەخۆ ڕێکدەخرێت و خشتەی خەرجی بۆ دەکرێت بۆ ئەمەش سەروو ئاگادار دەکرێتەوە و لە ژمێریاری ئاماژەی پێکراوە، بۆ ئەم مەبەستەش هیممەت بکرێت.






DH.MKT.01821.00081.001

<table>
<tr><th>DH.MKT.</th><th>01821.00081</th><th>14 شەعبان 1308</th></tr>
<tr><td colspan="3">١٤ شەعبان ١٣٠٨<br>١٢ مارت ١٣٠٧<br>بۆ نەزارەتی سندوقی خانەنشینی جەلیلە<br>قائیمقامی مردووی قەزای زێبار، جەمال ئەفەندی، خانەوادەکەی داوایان کردووە مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، بەو داواکاریەی کە پێشکەشیان کردووە حەواڵە کراوە، خشتەی ماوەی ئەرکەکانی ڕێکخراوە لەگەڵ کاغەزەکانی تری هاوپێچ نێردراوە، بە پشت بەستن بە بڕیارەکانی بڕیارنامەی تایبەتی لە بارەی جێبەجێ کردنیەوە فەرمان دراوەتە سەروو.</td></tr>
</table>




| 20 شەعبان 1308 | 01823.00049 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٠ شەعبان ١٣٠٨
١٨ مارت ١٣٠٧
بۆ نەزارەتی دارایی
قائیمقامی کۆچکردووی قەزای زێبار عەلی رزا ئەفەندی لە ساڵی ١٣٠٤ لە قەزای ناوبراو لە سندوقی دارایی پارەی کەڵەکەبووی مانگێك و نیوی هەیە، کە دەکاتە ١٨٠٠ و هەندێك قوروش، بۆ هێنانی لە قەزای ناوبراو، لەلایەن خێزانی کۆچکردووی ناوبراو داواکراوە بهێنرێت، بۆ جێبەجێ کردنیشی بە نووسراو ئاماژەی پێکراوە، ئەو ئاگادارکردنەوەی پێشووتر نێردراوە، لە وەڵامدا لە ویلایەتی موسڵ نووسراو وەرگیراوە، پارەی کەڵەکەبووی ناوبراو لە ١٨٩٠ قوروش و ٢٦ پارە، تەنیا ٦٢٥ قوروش سەر بە سندوقی خانەنشینی مولکیەیە، نیوەی مووچەی مانگانەکەیەتی هەروەها ٦٠٣ قوروش و ٢٣ پارەش لە ٥٪ ی وەستێنراوە، لەگەڵ کەمکردنەوەی ١٢٠٨ قوروش و ٣ پارە رەوان دەکرێت، بە پەسەندکردنی میراتگرانی کۆچکردووی ناوبراو لەلایەن خانەوادەکەیەوە یەك پارچە راگەیەندراوی شەرعی لەگەڵ وەرگرتنی سەنەدی وەرگرتن ئاماژەی پێکراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.






DH.MKT.01901.00075.001

| DH.MKT. | 01901.00075 | 13 جەمادی یەکەم 1309 |
|---|---|---|

١٣ جەمادی یەکەم ١٣٠٩
٣ کانوونی یەکەم ١٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵ
جەمال ئەفەندی کە قائیمقامی قەزای زێبار بووە بەهۆی کۆلێراوە کۆچی دوایی کردووە، پێشەکی ئەم هەواڵە بۆ سەروو نێردراوە کە ناوبراو بەهۆی کۆلێراوە نەمردووە، بەڵکو ئەو کاتەی لەسەر ئەرکەکەی بووە لەلایەن هەندێك چەتەوە کوژراوە، لەگەڵ گەیشتنی ئەو هەواڵە هەندێك ووتە وەرگیراوە و بانگکراو هەبووە، لەلایەن خێزانی ناوبراوی مردوو ناجیە خانم داواکاری پێشکەش کراوە، دواى لێکۆڵینەوەش لە بابەتەکە، هەواڵەکە پشت راست کراوەتەوە، پەلە بکرێت بۆ کاری پێویست.




DH.MKT.01917.00098.001

| DH.MKT. | 01917.00098 | 2 رەجەب 1309 |
| --- | --- | --- |

٢ رەجەب ١٣٠٩
٢٠ کانوونی دووەم ١٣٠٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی قەزای شەهربازار عەبدولقادر بەگ بەهۆی ئەوەی لە کاتی جموجۆڵی ناپەسەندی پشدەرەکان هیچ کاردانەوەیەکی نەبووە، هەروەها قائیمقامی قەزای زێبار عەبدوڵلا ئەفەندی بەهۆی خواردنەوەی، مانەوەیان گونجاو نییە، بۆ ئەم مەبەستە بۆ قائیمقامی شەهربازار قائیمقامی رانیە، عەبدولرەحمان بەگ کە لە کارەکەی دوور کەوتۆتەوە، دابمەزرێت، بۆ قائیمقامیەتی زێباریش کەسێکی گونجاو هەڵبژێردرێت و مۆڵەتی پێ بدرێت، ئەگەر چی لە ویلایەتی موسڵ ئاماژە بە ئەوە کراوە، بەڵام عەبدولرەحمان بەگ هەڵنەبژێردراوە و ئەوەی تریش خودی خۆی دانەمەزراوە، بۆیە بۆ قائیمقامیەتی شەهربازار لە چینی سێیەم، عارف هەڵبژێردراوە و بۆ قائیمقامیەتی زێباریش لە هەمان چیندا حاجی سەعید ئەفەندی هەڵبژێردراوە کە لە قائیمقامیەتی سیلوان دوور کەوتۆتەوە، بۆ دەست کردن بە ئەرکەکانیان نووسراو کراوە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەر داواکاری لەگەڵ دوو پارچە نووسراوی وەرگێردراو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردن.


DH.MKT.01931.00055.001

| 11 شەعبان 1309 | 01931.00055 | **DH.MKT.** |
|---|---|---|

١١ شەعبان ١٣٠٩
٢٧ شوبات ١٣٠٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی قەزای شەهربازار عەبدولقادر بەگ لەگەڵ پشدەرییەكان بەیەكەوە بوێریان كردووە كاری خراپ ئەنجامی بدەن، هەواڵ هاتووە كە دەستی لەم كارانەدا هەیە، هەروەها قائیمقامی قەزای زێبار عەبدوڵڵا ئەفەندی لەبەر هەندێك بارودۆخ مانەوەیان گونجاو نییە، لەوانە لە قائیمقامیەتی رانیە، عەبدولرەحمان بەگ كە دوورخراوەتەوە بۆ قائیمقامیەتی شەهربازار دابنرێت، بۆ قائیمقامیەتی زێباریش كەسێكی گونجاو هەڵبژێردرێت، بۆ وەرگرتنی مۆڵەت لە ویلایەتی موسڵ ئەو ئاماژەیەی كە هاتووە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران حەواڵە كراوە، ئەو بریارنامەیەی كە بەیەكەوە رێكخراوە و پێشكەش كراوە، عەبدولرەحمان هەڵنەبژێردراوە، بۆ ئەوەی تریش كەسی خۆی داوای دامەزراندنی نەكردووە، بۆ قائیمقامی ناوبراوان ئەگەرچی نووسراو كراوە بۆ ئەوەی عارف ئەفەندی و حاجی سەعید ئەفەندی دامەزرێن، لەم بارەیەوە بە گوێرەی ئەو وەڵامەی بۆ نووسراوی زانیاری هاتووە، هەروەها ئەو تەلەگرافنامەیەی هاتووە عەبدولقادر بەگ بۆ زێبار و قائیمقامی زێباریش عەبدوڵڵا ئەفەندی بۆ شەهربازار بگۆردرێنەوە و دامەزرێن، بۆ ئەمەش هیمەت بكرێت.



| 1309 شەوال 15 | 01948.00093 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٥ شەوال ١٣٠٩
٣٠ نیسان ١٣٠٨
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی پێشووی شەهربازار عەبدولقادر بەگ دوای ئەوەی بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار گوازراوەتەوە، لەلایەن هەندێك کەسەوە سکاڵای لەسەر تۆمار کراوە، بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە بنکەی موسڵ بە واژووی حەریق .... ..... فەتاح و ئەوانی تر تەلەگرافنامە نێردراوە، بە تێروانین لە تەلەگرافنامەکە داوا کراوە هیممەت بکرێت بۆ لێکۆڵینەوە و ئەنجامی کۆتایی رابگەیەندرێت.




| 29 شەوال 1309 | 01954.00001 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٩ شەوال ١٣٠٩
١٤ مایس ١٣٠٨
بۆ ویلایەتی موسڵ
گۆڕینـەوەی ئەرکەکەیـان جێبەجـێ کـرا، راگەیەنـدراوە قائیمقامـی قـەزای شـەهربازار عەبدولقـادر بـەگ لەگـەڵ قائیمقامـی قـەزای زێبـار عەبدوڵـڵا ئەفەنـدی لـە گەیشـتنیان بـۆ ئەرکـە نوێیەکەیـان و مێـژووی دەسـتبەکاربوونیان بـە تۆمـاری مانگانـە ١٢٥٠ قـوروش مووچەیـان پـێ دەدرێـت، هەروەهـا تۆمارکراوەکانیـان رێکدەخرێـت، لـەوێ جێبەجـێ دەکرێـت، هەروەهـا راگەیەنـدراوی مێـژووی دەسـتبەکاربوونیان بـۆ واڵا نووسراوەتـەوە، لەگەڵ باسـکردنی لـە ژمێریـاری جێبەجـێ دەکرێـت.


DH.MKT.01965.00018.001

| 27 زیلقەعدە 1309 | 01965.00018 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٧ زیلقەعدە ١٣٠٩
١٠ حوزەیران ١٣٠٨
بۆ نەزارەتی دادوەری جەلیلە
لـە نێـوان دانیشـتووانی قـەزای زێبـار رووبەرووبوونـەوە و شـەڕ روویـداوە، بـەم هۆیـەوە چەنـد کەسـێك بریندارربوونـە و کـوژراون، هەروەهـا کەلوپـەل و پارەوپولـی هەنـدێـك دانیشـتووانی چەند گوندێکیـان تاڵان کـردووە، بـۆ لێکۆڵینـەوە ئەگەرچـی لـە شـوێنی تاوانەکـە داوا لـە یاریـدەدەری داواکاری گشـتی کـراوە بچێتە شـوێنەکە، بـەڵام لەگـەڵ خـۆی هێـزی سـەربازی نابـات، بـۆ جێبەجـێ کردنـی بابەتەکـە لەسـەر داواکاری نەزارەتپەناهـی لـە ویلایەتـی موسـڵ داوای زانیـاری کـراوە، ئەمجـارە لـە وەڵامـدا هاتـووە، بـە گوێـرەی نـووسراوەکان یاریـدەدەری ناوبـراو داواکـراوە بچێتـە شـوێنی رووداوەکـە بە مەبەسـتی لێکۆڵینەوە، لـە رووی یاسـاییەوە رێکخـراوە، لەگـەڵ ئـەوەش لەسـەر ئەنجـام نەدانـی کارەکـە، تەنیـا یـەك یوزباشـی لەگـەڵ برێـك پۆلیـس نێـردراوە و لێکۆڵینـەوە کـرا و زانیاریـەکان نێـردراوە.




| 12 سەفەر 1310 | 00004.00042 | I.TAL. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٤١٥
بۆ جەنابی دەوڵەت
لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای زێبار عەبدولقادر بەگ شایەنی رێزلێنانە، بۆیە لە پایەی ئیستەبلی عامیرە بە بەرزکردنەوەی بۆ میری میران نووسراو لە نەزارەتی ناوەخۆ پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە بە هەموو شێوەیەك ئەمر و فەرمانی هومایۆن ئەگەر جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرموویەت ئەوا پێشکەش کراوە بەرێزم، لە ١٢ سەفەر ١٣١٠ و لە ٢٢ ئۆغستۆس ١٣٠٨.
سەدری ئەعزەم و یاوەری




| BEO. | 000117.008760 | 15 جەمادی یەکەم 1310 |
|---|---|---|
| ١٥ جەمادی یەکەم ١٣١٠<br>٢٣ تشرینی دووەم ١٣٠٨<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بـۆ گۆڕینـەوەی ئەرکـی قائیمقامـی قـەزای رانیـە، حاجـی سـەعید ئەفەنـدی لەگـەڵ قائیمقامی قـەزای زێبار، عەبدولقـادر پاشـا، بـە نـووسراوی دەوڵـەت بـە مێـژووی ٨ جەمـادی یەکـەم ١٣١٠ ژمـارە ١٦٢٦ و ڕەزامەنـدی فەرمانـی پاشـای جەنابـی خەلافەتپەناهـی بـۆ جێبەجـێ کردنـی هیممەت کـراوە، بۆ ئەم مەبەسـتە نـووسراو کراوە. | | |


İ.DH.01300

| 24 رەبیعی کۆتایی 1310 | 01300.000029 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی ناوەخۆ
قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران
ژمارە ٦٢٢
لە ناو ویلایەتی موسڵ سانجەقی شارەزوور قائیمقامی قەزای رانیە، حاجی سەعید ئەفەندی لە کاتی گەیشتنی بۆ مەرکەزی قەزاکە لەگەڵ کەشوهەواکەی ئەوێ ناگونجێت، داوای کردووە بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، هەروەها قەزای ناوبراو لەگەڵ ئێران لە رووی سنوورەوە گرنگە کە زیاتر یەك تاقم عەرەب و هۆز لەو ناوچەن، ئەو قائیمقامەی کە دەدۆزرێتەوە دەبێ لە نێو هۆزەکان خاوەن لایەنگر بێت و زانیاری لەسەر ناوچەکە هەبێت، هەروەها قائیمقامی قەزای زێبار، عەبدولقادر پاشا لەبەر ئەو خەسڵەتە باسکراوانەی کە هەیەتی، حاجی سەعید ئەفەندی بۆ زێبار و عەبدولقادر پاشا بۆ قائیمقامیەتی رانیە بگۆردرێنەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە دەرچووە و حەواڵە کراوە، لە مێژووی ٢١ تشرینی یەکەم ١٣٠٨ دوو پارچە تەلەگرافنامە خوێندراوەتەوە و راگەیەندراوە، بەم هۆکارانەوە بە ئاماژە پێکردنەوە قائیمقامی رانیە، حاجی سەعید ئەفەندی بۆ زێبار و قائیمقامی زێبار، عەبدولقادر پاشا بۆ رانیە گۆرینەوەیان پەسەند کراوە و نووسراویش کراوە، دوای فەرمانی جەنابی نەزارەتپەناهی، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٤ رەبیعی کۆتایی ١٣١٠ و لە ٢ تشرینی دووەم ١٣٠٨




DH.MKT.01995.00026.001

| 8 سەفەر 1310 | 01995.00026 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٨ سەفەر ١٣١٠
١٨ ئۆغستۆس ١٣٠٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای زێبار، عەبدولقادر بەگ شایەی ئەوەیە رێزی لێ بگیرێت، هەر بۆیە گونجاوە لە پایەی بەرێوەبەری ئستەبڵی عامیرە پلەکەی بۆ میری میران بەرز بێتەوە و بگۆردرێت، بۆ جێبەجێ کردنیشی بە هاوکاری سەدارەتپەناهی دەبێت.



DH.MKT.02000.00096.001

| DH.MKT. | 02000.00096 | 20 جەمادی یەکەم 1310 |
|---|---|---|
| ٢٠ جەمادی یەکەم ١٣١٠<br>٣١ ئۆغستۆس ١٣٠٨<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>قائیمقامی قەزای زێبار، عەبدولقادر بەگ لەبەر باشی و دڵسۆزی لە پایەی بەڕێوەبەرایەتی ئستەبڵی عامیرە پلەکەی بۆ میری میران بەرز بۆتەوە، ئەمەش لەلایەن جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی دراوە. | | |




| 8 جەمادی یەکەم 1310 | 02025.00079 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٨ جەمادی یەکەم ١٣١٠
١٦ تشرینی دووەم ١٣٠٨
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی قـەزای رانیـە، حاجـی سـەعید ئەفەنـدی لەگـەڵ قائیمقامـی قـەزای زێبـار، عەبدولقـادر پاشـا ئەرکەکەیـان دەگۆردرێتـەوە، لەسـەر ئاماژەکـردن لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو کـراوە، ئـەو داواکارییـەی لە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران دراوە، بـە هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، داوای جێبەجـێ کردنـی دەکرێت.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
428 | 32044

BEO.000428.032044.001

| 27 زیلحیجە 1311 | 000428.032044 | BEO. |
|---|---|---|

١٩ حوزەیران ١٣١٠

ویلایەتی موسڵ

لە ١٣ حوزەیران ١٣١٠ دانیشتووانی قەزای زێبار دەرکەوتووە دەستیان بە جموجۆڵ کردووە و شێخ محەمەدیش سوود لە نەزانی ئەوانە وەردەگرێت و بۆتە هۆی جولە پێ کردنیان، بۆ ئەمەش ئامادەکاری پێویست کراوە، ناوبراو هەروەها ئەو قازیەی پروپاگەندەی کەرامەت دەکات، بە شێوەیەکی جوان دەهێنرێتە بنکەی ویلایەت، ئەمەش بە ماددەی سەربازی بۆ لایەنی سەر عەسکەر نووسراوەتەوە، دواتر لە جێبەجێ کردنەکە رادەگەیەندرێت.


DH.ŞFR.00174.00063.001

| 6 زیلحیجە 1312 | 00174.00064 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قائیمقامی قەزای شەهربازار، شەوقی بەگ لەگەڵ قائیمقامی عەقرە بگۆردرێنەوە، بەم بۆنەیەوە تەلەگرافنامە بۆ سەدارت نێردراوە، قەزاکانی عەقرە و زێبار و ناحیەی عشائیری سەبعە ئەو ناکۆکیەی لە نێوانیاندا هەیە، هەرچی زووە چارەسەرێکی بەپەلە بدۆزرێتەوە و کۆتایی پێ بهێنرێت، هەروەکو میری ناوبراو کەسێکی لێهاتوو بۆ قائیمقامیەتی قەزای عەقرە بدۆزرێتەوە، ئەمەش بەپەلە بنێردرێت و بە فەرمانی گۆرینەوەیان قەزاکان یەکسان بکرێن، بەپەلە جێبەجێ بکرێت، ١٩ مایس ١٣١١.
عەزیز والی موسڵ



| 8 شه‌وال 1312 | 00358.00078 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بۆ جه‌نابی سه‌داره‌تپه‌ناهی
٨ شه‌وال ١٣١٢
٢٢ مارت ١٣١١
له‌ ئاغاكانی زێبار حه‌سه‌ن ئاغا و عه‌بدوڵلا ئاغا و سه‌لیم خان ئاغا به‌هۆی ئه‌و خزمه‌ته‌ی كه‌ كردوویانه‌، له‌ پله‌ی پێنج بۆ هه‌ر یه‌كه‌ به‌ یه‌ك پارچه‌ نیشانی نیشان ڕێزیان لێگیراوه‌، بۆ ئه‌مه‌ش نووسراو به‌ مێژووی ١٣ شوبات ١٣١٠ ژماره‌ ٢٢٦ له‌ ویلایه‌تی موسڵ هاتووه‌ و له‌گه‌ڵ ئه‌م نووسراوه‌ هاوپێچ پێشكه‌ش كراوه‌، بۆ جێبه‌جێ كردنی جه‌نابی سه‌داره‌تپه‌ناهی هاوكاری كردووه‌.



BEO.000486.036377.002

| 29 رەبیعی کۆتایی 1312 | 000486.036377 | BEO. |
|---|---|---|
| ١٨ ئەیلوول ١٣١٠<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>عەبدولرەحمان بەگ لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان ٢٠ هەزار قوروش چۆتە سەر ناوی، لە قەزای زێبار بە بریکار دامەزرا، بە ئاماژەی جەنابتان هەواڵ دراوە. | | |




BEO.000486.036398.002

| BEO. | 000486.036398 | 25 ڕەبیعی کۆتایی 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٢٦٩٢
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەتانە

پێشەکی لە هەندێك قائیمقامی قەزاکان بە شێوەی وەکالەت خزمەتی باشی کردووە، بۆیە عەبدولرەحمان بەگ بە وەکالەت لە قەزای زێبار وەکو قائیمقام دامەزراوە، لەبەر سەنگینی تەلەگرافنامە بۆ ویلایەتی موسڵ نێردراوە، هەروەها لە مێژووی ١٧ ئەیلوول ١٣١٠ ژمارە ٢٠٠٩ نووسراوی سەدری ئەعزەم لە سەدارەتپەناهی دەرچووە، لەسەر دامەزراندنی ناوبراو لە قائیمقامیەتی ناوهاتوو داواکاری دراوەتە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران، لەوێشەوە بە مێژووی ١٤ ئەیلوول پێشکەش کراوە ئەمەش بە تۆمارکردنی دەرکەوتووە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٥ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٢ و لە ١٣ تشرینی یەکەم ١٣١٠.

نازری کاروباری ناوەخۆ



| 22 رەبیعی کۆتایی 1312 | 000500.037445 | **BEO.** |
|---|---|---|

٢٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی موسڵ ماوەیەکە قەزای زێبار بە وەکالەت قائیمقامیەتەکەی بەڕێوەدەچێت، پێشەکی بە وەکالەتی هەندێك قائیمقام بەڕێوە چووە، لەوانە عەبدولرەحمان بەگ، کە خەریکە سوێند خواردنەکەی جێبەجێ دەکرێت، لە بارەی دامەزراندنیەوە بە نووسراوی دەوڵەت لە مێژوی ٢٦ رەبیعی یەکەم ١٣١٢ ژمارە ٢٣١٠ و بە لاری نەبوونی مێژووی ٢٠ رەبیعی کۆتایی ١٣١٢ بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمان دراوە، هیممەت بکرێت.



| 10 زیلقەعدە 1313 | 00005.00044 | I.TKS. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٢٧١٩
بۆ جەنابی دەوڵەت
بریکاری قائیمقامی قەزای زێبار محەمەد بەهجەت ئەفەندی پشت بەستن بە بریاری بریارنامە مانگانە بە ٧٧٨ قوروش خانەنشین دەکرێت، بۆ مامەڵەی پێویست داواکاری بە هاوپێچەوە لە فەرمانگەی رێکخستنی شورای دەوڵەت پێشکەشی نەزارەتی سندوقی خانەنشینی فەرمانبەرانی جەلیلە کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت ئەمر و فەرمانی هومایۆنی جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرموویەت ئەو دەکرێت بەرێزم، لە ١٠ زیلقەعدە ١٣١٣ و ١١ نیسان ١٣١٢.
سەدری ئەعزەم




DH.ŞFR.00175.00074.001

| DH.ŞFR. | 00175.00074 | 3 موحەڕرەم 1313 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>شیفرە<br>لەبەر ئەو ناکۆکیەی لە نێوان هۆزەکانی قەزای زێبار لەگەڵ هۆزەکانی ناحیەی سەبعەدا هەیە، قائیمقامی شەهربازار شەوقی لەگەڵ قائیمقامی قەزای عەقرە بگۆردرێنەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە مێژووی ٩ مایس ١٣١١ تەلەگرافنامە هاتووە، چاوەڕێی فەرمانی نەزارەتپەناهی دەکرێت، فەرمان، لە ١٤ حوزەیران ١٣١١.<br>عەزیز والی موسڵ | | |

| C.ML. | 548.22546 | 7 جەمادی یەکەم 1264 |
| --- | --- | --- |

٧ جەمادی یەکەم ١٢٦٤
والی شامی شەریفی پێشوو عەلی پاشا لە کاتی ئەوەی والی غداد بووە، قائیمقامی هەولێر مستەفا پاشا لە کاتی ئەرکەکەیدا خەرجی رێگای بە گوێرەی پێویست لە بەغداد پێی دراوە، ٢٥٠٠٠ قوروش ئاقچەی خەرجی رێگای لە بەغداد لەلایەن براکەی گەرگور دراوە، ئەگەرچی بەم دواییەش دابینکردنی خەرجیەکە حەواڵەی هەندێك لە موقاتەعە و سەروەتی تر کراوە، بەڵام تا ئێستا ٢٥٠٠٠ قوروش نەنێردراوە، بە مەبەستی ناردنی داوا لە بازرگانی ئەوروپی رەفائیل کراوە، لە وەڵامی فەرمانانامەی پاشا والی بەغداد نووسراو نێردراوە، لە ئەنجوومەنی ژمێریاریش نێردراوەتە قەڵەم، بە پارچەیەك داواکاری بەستراوەتەوە.



| 16 شەوال 1313 | 00942.00079 | ŞD. |
|---|---|---|

فەرمانگەی خانەنشینی مولکیە
ژمارە ۳۹۰۲
لەلایەن بریکاری قائیمقامی قەزای زێبار، محەمەد بەهجەت ئەفەندی داوای جێبەجێکردنی خانەنشینی کردووە، لە ویلایەتی مەعمورەتولعەزیزە داواکاری پێشکەش کراوە، لەگەڵ داواکاریەکەی خشتەی ماوەی خزمەتی لەسەر کاغەزی لە ژمێریاری رێکخراوە، بە پەراوێز ژماردنی لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
بە گوێرەی ئەو خزمەتانەی کە ناوبراو کردوویەتی لەگەڵ مێژووی بری ئەو مووچانەی کە وەریگرتووە و لە مێژووی ٤ مایس ۱۳۱۰ دەستی کێشاوەتەوە، هەروەها ماوەی خزمەتی ۳۲ ساڵ دەبێت، بە پشت بەستن بە بریاری فەرمانبەرانی مولکیە، ماددەکانی ۲٦ و ٤۲ دوای زیادکردن و کەم کردنەوە، ۷۷۸ قوروش مووچەکەی جێگیر کراوە، بە نیشان دانی، ئەو برە مووچەیەی لە سندوق رێکخراوە، نووسراو بۆ خانەنشین کردنی جێبەجێ کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٦ شەوال ١٣١٣ و لە ١٩ مارت ١٣١٢


صحیفه ٤٧١
سجل عمومی

AİDd.00068

| 22 رەبیعی یەکەم 1314 | 00068.00237 | **DH.SAIDd.** |
|---|---|---|

محەمەد جەمال ئەفەندی کوڕی حاجی زێبارزادە ئەحمەد ئاغا
لە ساڵی ١٢٩٠ ساڵی واتە ١٢٨٩ لە ویلایەتی ئەرزروم لە قەسەبەی بایەزید لە دایك بووە و لە تۆماری ناسنامەی عوسمانی ناوی نووسراوەتەوە، لە قەسەبەی ناوهاتوو لە مەکتەبی روشدیە زانستی یاسای خوێندووە، دوای ئەوە کەمێك فێرە زمانی عەرەبی و فارسی بووە، بە زمانی تورکی دەخوێنێتەوە و دەنووسێت هەروەها ئاشنای زمانی کوردی و ئەرمەنییە، لە ساڵی ١٣٠٠ کۆچی واتە تشرینی یەکەم ١٣٠٣ لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا لە دادگای سانجەقی بایەزید و لە کۆتاییدا لە قەزای کلیسا کاری کردووە، لە ساڵی ١٣٠٩ مانگی رەمەزانی شەریف ١٦ نیسانی ١٣١٨ بە مووچەی ١٢٥ قوروش لە قەزای ناوهاتوو بۆتە نووسەری ناسنامە.
لەو تێبینیانەی کە لە ئەرکی فەرمانبەرێتی قەزای ناوهاتوو لە ناسنامە و قائیمقامیەت نووسراوە، لەم کارە وەرگێراوی وێنەکەی و لە ویلایەتی ئەرزروم لە نەزارەتی ناسنامە و والیەتدا لەگەڵ تێبینی باسکراوەکان و بەرێوەبەرایەتی ناسنامەی گشتی ئەرکەکەی پەسەند کراوە.
لە تۆماری ناسنامەی عوسمانی وێنەکە پەسەند کراوە و دانە رەسەنەکەی پارێزراوە.
لە ٢٢ رەبیعی یەکەم ١٣١٤ و ٢١ ئۆغستۆس ١٣١٢



DH.ŞFR.00200.00019.001

| DH.ŞFR. | 00200.00019 | 17 سەفەر 1314 |
|---|---|---|

وەڵامی نووسراوی نەزارەتپەناهی لە مێژوی ١٧ ئەیلوول ١٣١٢ عەبدولرەحمان بەگ لە قائیمقامیەتی زێبار بۆ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق گوازراوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی گواستنەوەی گونجاو نییە، بۆیە عەلی رزا ئەفەندی وەکیلی قائیمقامی پێشوو بەهۆی لێهاتووییەوە لە قەزای ناوهاتوو دامەزرێت، هەرچی عەبدولرەحمان بەگ لە قەزاکەی تر دەست بەکار بێت و عەلی رزا ئەفەندیش لە قائیمقامیەتی کۆی سانجەق دامەزرێت، بۆ جێبەجێ کردنیش ئەمر و فەرمان، لە ١٦ تشرینی یەکەم ١٣١٢.

عەبدوڵڵا قوماندان و والی موسڵ



| 7 سەفەر | 01336.000024 | I.DH. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٤٧٦
بۆ جەنابی بەڕێزم
لە ناو ویلایەتی تەبلیس قەزای مەلازگرد، قائیمقام خەلیل سدقی ئەفەندی لەبەر لێنەهاتووی گونجاو نییە لە ئەرکەکەی بەردەوام بێت، ئەو ئاماژەیەش بە ناوەخۆ ڕاگەیەندراوە، لە داهاتوودا لە کاتی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی پلەی قائیمقامیەت دووربخرێتەوە و لە شوێن ئەو قائیمقامی پێشووی زێبار، حاجی سەعید ئەفەندی کە لە زمانی شوێنەکە شارەزایە، بۆ دامەزراندنی لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران بریارنامە ڕێکخراوە، لەگەڵ کاغەزی زانیاری کەسێتی وەرگێردراو نێردراوە، نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لەگەڵ بریارنامەکە لە قۆمیسیۆنی سەرپەرشتیاریکردن دراوەتە قەڵەم و ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، بە هەر شێوەیەك بێت ئەمر و فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی بفەرمووێت، جێبەجێ دەکرێت، لە ٧ سەفەر ١٣١٤ و لە ٦ تەمموز ١٣١٢.
سەدری ئەعزەم




| I.DH. | 01338.000010 | 7 سەفەر 1314 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
٣٠٠

لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق، سەعدی ئەفەندی بەهۆی مردنیەوە شوێنەکەی بەتاڵە، لەبەر ئەوەی قەزای ناوبراویش هۆزێکی زۆری کۆچەری تێدایە و شوێنەکە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران، گرنگی شوێنەکە دیارە، بۆیە قائیمقامی زێبار کە لە زۆر شوێن قائیمقام بووە و لە عەقڵیەتی هۆزگەرایەتی شارەزایە بگوازرێتەوە، هەرچی قەزای زێباریشە، ئاسف ئەفەندی کە دیسان لە عەقڵیەتی هۆزگەرایەتی شارەزایە و دەتوانی بەسەریەوە زاڵ بێت، لە قائیمقامیەتی زێبار دابمەزرێت، بەم بۆنەیەوە کاغەزی وەرگێردراوی نێردراوە، لە ویلایەتی ناوهاتوو لە ئەنجوومەنی کارگێری داواکاری بە مێژووی ١٥ مایس ١٣١٢ ژمارە ٣٤ حەواڵە کراوە، راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە.

لە کاتیووردبینی قەزاکانی کۆی سانجەق و زێبار لە چینی سێیەمن، ناوبراوان عەبدولرەحمان بەگ لەگەڵ ئاسف ئەفەندی بە تۆمار دەرکەوتووە هەڵبژێردراو نین، بە پەلە ئەوەی لێرە بۆ قائیمقامیەت هەڵبژێردراوە، لەلایەن لایەنێکەوە باسکراوە، بەڵام لەلایەن ویلایەتی ناوبراو لە بارەی هەڵبژاردنیەوە بە بریاری شورای دەوڵەت قەزاکانی ناوبراو بەهۆی دووری شوێنەکان و لە چینی سێیەمن، بۆیە حەز لەوە ناکەن هەڵبژێردرێن، بۆیە بە گوێرەی ئاماژە پێ کردنیەوە بریاری لەسەر درا قائیمقامی زێبار عەبدولرەحمان بەگ بۆ قائیمقامیەتی قەزای کۆی سانجەق بگوازرێتەوە، هەروەها بۆ قائیمقامیەتی زێباریش ئاسف ئەفەندی دابمەزرێت، جگە لەمە ناوبراوان کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری ئاسف ئەفەندی رێکخراوە و پێشکەش کراوە، بە مۆڵەت وەرگرتن ئەمر و فەرمانی هومایۆنە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٧ سەفەر ١٣١٤ و لە ٦ تەمموز ١٣١٢
ئەندام و باش کاتیب/ ئەندام/ سەرۆکی قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران




DH.ŞFR.00224.00008.001

| DH.ŞFR. | 00224.00008 | 22 زیلحیجه 1315 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لەبەر ئەوەی دووبارە کاری سەرپێچیکارانەیان سەری هەڵداوەتەوە، موریدەکانی بارزان لەگەڵ هەرکیەکان یەکیان گرتووە لەگەڵ شێخی بجیل چوونەتە سەر هۆزی سورجیەکان و هێرشیان کردۆتە سەریان، لە ئەنجامی رووبەرووبوونەوەکەدا کۆمەڵێك خەڵك کوژراون، هەروەها لەبەر سەرژمێری سەر مەڕ، سەربازی شاهانە چوونەتە گوندی گەلاڵە، سێیان کوژراون و یەکێکیان بریندار کراوە، لەگەڵ جبەخانە شەش تفەنگ تالان کراوە، بۆ یارمەتی دانی سەربازی شاهانە کە لە ژێر ئابلوقە ماونەتەوە هەواڵ دراوەتە قائیمقامیەتی زێبار و عەقرە، لەوێ سەربازی شاهانە هێنراون، بۆ ئەوەی تاوانباران تەمبێ بکرێن و دەستگیر بکرێن، بەپەلە یەك تابور بۆ ناوچەی رووداوەکە بنێردرێت، ئەمەش بۆ موشیرەتی جەلیلە نووسراوەتەوە، زانیاریەکان راگەیەندراوە، فەرمان، لە ٢ مایس ١٣١٤.

عەبدولوەهاب والی موسڵ

| 1315 زیلحیجە 23 | 00224.00011 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
تەلەگرافەکانی بە شیفرە لە مێژووی ٢ و ٣ مایس ١٣١٤ راگەیەندراوە، لێرە شێخی بارزان هۆزەکان هان دەدات و کاری گەندەڵیان پێ دەکات، شێخ محەمەدی شێخی بازران چۆتە سانجەقی هەکاری قەسەبەی نەهری لای شێخ سدیق ئەفەندی کوڕی شێخ عوبیدوڵلا، لە ژێر باڵی ئەو شەر دەکات، لەگەڵ دەستگیرکردنی بە پارێزراوی بهێنرێتە ئێرە، ئەمەش بۆ ویلایەتی وان نووسراوەتەوە، بۆ ئەم کارەش لەلایەنی سەروو بە فەرمانێکی بەپەلە بۆ نەزارەتپەناهی نێردراوە، لە ٣ مایس ١٣١٤.
عەبدولوەهاب والی موسڵ



| 7 جەمادی کۆتایی 1315 | 001033.077460 | BEO. |
|---|---|---|

٧ جەمادی کۆتایی ١٣١٥
٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٣
بۆ نەزارەتی سندوقی خانەنشینی فەرمانبەرانی جەلیلە
بەهـۆی مردنـی باوکـی عەلـی رزا ئەفەنـدی قائیمقامـی قـەزای زێبـار، خانەوادەکـە لـە پێنـج ئەنـدام پێـك هاتـوون، لـەو ١٥٠ قوروشـەی کـە بۆیـان دابیـن کـراوە، پێشـەکی بەهـۆی هاوسـەرگیری خوشـکەکانی ٦٠ قـوروش بـراوە، ئـەوە ماوەتـەوە ٩٠ قوروشـە، بـەم پارەیـە بەرێوەدەچـن. بارودۆخەکـە ئەوەیـە بـرادەرە بچووکەکـەی لەگـەڵ خـۆی لـە رێـزی سـەربازین، ٥٠ قـوروش مووچـەی مەکتەبیـان بـراوە و هێنراوەتـە خـوارەوە، هەروەهـا خانەوادەکەیـان بـەم بەشـە مووچەیـە ناتوانـن بەرێوەبچـن، مووچـەی ناوهاتـوو ١٥٠ ئەگـەر هیـچ نەبێـت، تـکا دەکـەم ٩٠ قوروشـەکەی پـێ بدرێـت، ئـەو داواکاریە لەلایـەن عەلـی رزا ئەفەندی بـە رێگـەی مەکتەبـی دواناوەنـدی شـاهانە دراوەتـە دەوڵـەت، بـۆ جێبەجـێ کـردن هیمـەت بکرێـت.



داخليه نظارت جليله سنه تذكره

موصل ولايتی داخلنده بازيان قضاسی قائممقامی صالح بكله عقره وعقره قائممقامی شوقی افنديلك معمورة العزيز ولايتی داخلنده ملازكرد قضالری قائممقاملقرينه نقللريله بازيان قائممقاملغنه مركز قائممقامی سابقی عبد القادر پاشانك وزيبار قائممقامی آصف افنديلك عزللريله يرينه اربيل قائممقاملغی انبا اولنان عبد الله بكله تعيينلری خصوصنه ١٠ ربيع الآخر ٣١٥ تاريخلی و ٢٣٤١ نومرولو تذكرهٔ دولتلری اوزرينه مأمورين ملكيه قومسيونيله قرار بالاستيذان ٣ جمادی الآخره ٣١٥ تاريخنده ارادهٔ سنيهٔ جناب خلافتپناهی شرفصدور بيورلمش اولمغله ايفای مقتضاسنه همت.

| 7 جەمادی کۆتایی 1315 | 001033.077462 | BEO. |
|---|---|---|

٧ جەمادی کۆتایی ١٣١٥
٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لـە ویلایەتـی موسـڵ قائیمقامـی قـەزای بازیـان، سـاڵح بـەگ بـۆ عەقـرە، قائیمقامـی عەقـرەش، شـەوقی ئەفەنـدی بـۆ قـەزای ملازگـرد لـە ویلایەتـی مەعمورەتولعەزیـزە بگوازرێنـەوە، بـۆ قائیمقامـی بازیانیـش قائیمقامـی پێشـووی مەرکـە، عەبدولقـادر پاشـا و قائیمقامـی زێبـار، ئاسـف ئەفەنـدی دوور بخرێتـەوە و لـە شـوێن ئـەو عەبدوڵـڵا بـەگ کـە لـە قائیمقامیەتـی هەولێـر ئەرکەکـەی کۆتایـی هاتـووە دابمەزرێـن، بـۆ ئەمـەش نـووسراوی مێـژووی ١٠ رەبیعـی کۆتایـی ١٣١٥ ژمـارە ٢٣٤١ و بریـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبـەران بـە مۆڵـەت وەرگرتـن لـە مێـژووی ٣ جەمـادی کۆتایـی ١٣١٥ بـە فەرمانـی پاشا جەنابـی خەلافەتپەناهـی رەزامەنـدی داوە، هیممـەت بکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنـی.



DH.MKT.02089.00048.001

| 27 زیلحیجە 1315 | 02089.00048 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٧ مایس ١٣١٤
بۆ ویلایەتی وان
شیفرە
مەحمود لە شێخەکانی بارزان، بە مەبەستی گەندەڵی هۆزەکانی تر هان دەدات، ئەمەش دەبێتە هۆکاری شۆڕش و شەڕ، هەروەها لە سانجەقی هەکاری لە قەسەبەی نەهری چۆتە لای شێخ سدیق ئەفەندی کوڕی شێخ عوبیدوڵڵای مردوو، ئەم زانیاریانە نووسراوەتەوە و بە ویلایەتی موسڵ ووتراوە، کە بنێردرێتەوە.




بو

باش کتابت دردنجی اردوی همایونلری مشیریتندن شیفره

ج ٩ حزیران ٣١٤ عقره و زیبار قائممقاملری حقنده همان تحقیقات لازمه یه ابتدار قلنمش اولمغله استحصال
اولنه جق نتیجه نک برموجب امر و فرمان همایون جناب ظل اللهی خاکپای حضرت ولی نعمت افندیه عرضه
مسارعت اولنه جغنی عرض جرأت ایلدم اول بابده و فرمان ٢ صفر ٣١٦ و ١١ حزیران ٣١٤

مشیر
محمد زکی



Y.PRK.ASK.00140.00007.001

| 2 سەفەر 1316 | 00140.00007 | Y.PRK.ASK. |
|---|---|---|
| لە موشیرەتی باش کیتابەتی لەشکری چوارەمی هومایۆن<br>شیفرە<br>لە ٩ حوزەیران ١٣١٤ بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بارەی قائیمقامەکانی عەقرە و زێبار دەستی پێ کردووە، بوێری دەکەم لە ووتنی ئەو ئەنجامەی دەست دەکەوێت بە پەلە بدرێتە سەروو، فەرمان، لە ٢ سەفەر ١٣١٦ و ١١ حوزەیران ١٣١٤.<br>موشیر محەمەد زەکی | | |



٢٧٥٥

٣٠ ذى القعده ١٣١٦

٣٠ مارت ١٣١٥

داخليه نظارت جليله سنه

تذكره

موصل ولايتى داخلنده صلاحيه قضاسى قائممقاملغنه اربيل قضاسى قائممقامى رشدى افنديله ويرينه زيبار
قضاسى قائممقامى عبدالله بكك تعيينلرى خصوصنه ٢٣ شوال ١٣١٦ تاريخلى و ٤٩٣٦ نومرولو تذكرهٔ
دولتلرى اوزرينه مأموريه ملكيه قومسيونله قرار بالاستيذان ٢٨ ذى القعده ١٣١٦ تاريخنده ارادهٔ سنيهٔ
جناب خلافتپناهى شرفصدور بيورلمش اولمغله اقتضاسنك ايفاسنه همت.

| 30 زیلقەعدە 1316 | 001294.097028 | BEO. |
|---|---|---|

٣٠ زیلقەعدە ١٣١٦
٣٠ مارت ١٣١٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ قائیمقامیەتی قەزای سەڵاحیە قائیمقامی قەزای هەولێر روشدی ئەفەندی بۆ شوێن ئەویش قائیمقامی قەزای زێبار عەبدوڵڵا بەگ، لە بارەی دامەزراندنیانەوە لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٢٣ شەوال ١٣١٦ ژمارە ٤٩٣٦، بریار لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە لە ٢٨ زیلقەعدە ١٣١٦ رەزامەندی دراوە، فەرمانی پاشا لەلایەن جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمان کراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێکردنی.



DH.MKT.02167.00027.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02167.00027</td><td>7 شەوال 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">٤ شوبات ١٣١٤<br>بۆ جەنابی سەر عەسکەر<br>لە نێوان شێخ و موریدەکانی بازیان و بجیل رووبەرووبوونەوە و پەلاماردانی یەکتر روویداوە، بۆ کۆتایی هێنان بەم ناکۆکیە سەرەتا بۆ زێبار و عەقرە هەر یەکە یەك مەفرەزە نێردراوە، بە هۆی ئەو مەفرەزانەوە شەرەکانیان وەستاوە، لە کۆتاییدا موریدەکانی بارزان لەگەڵ تاقمێك خەڵکی ترەوە یەکیان گرتووە و کەلوپەل و مەروماڵاتی هەندێك گوندیان تاڵان کردووە، رێگەگرتن لەم هێرش و رووبەرووبوونەوەی ئەو کۆمەڵانە لە سەرووی هێز و توانای پۆلیسە، بۆیە ناردنەوەی مەفرەزەکانی ناوهاتوو راگیراوە، ناردنەوەی ئەوانە بۆ موشیری لەشکری شەشەمی هومایۆن نووسراوەتەوە، هێشتا ئاگاداری بەپەلەش نەدراوەتە لایەنی والای سوارە، ئەمجارە لە ویلایەت بە هاوپێچ تەلەگرافنامە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن.</td></tr>
</table>






DH.MKT.02174.00102.001

| DH.MKT. | 02174.00102 | 23 شەوال 1316 |
| --- | --- | --- |

٢٣ شەوال ١٣١٦
٢٢ شوبات ١٣١٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
مەجید بەگ قائیمقامی قەزای سەلاحییە دەگوازرێتەوە بۆ قائیمقامیەتی قەزای رواندز، بۆ شوێنی بەتاڵیش قائیمقامی هەولێر روشدی ئەفەندی دابنرێت و بۆ شوێنی ناوبراویش عەبدوڵلا بەگ بگوازرێتەوە کە سەرەتا قائیمقامی زێبار بووە، ئێستاش لە هەولێر بوونی هەیە و کاری باشی کردووە، بۆ ئەم مەبەستە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە و ئاماژەی پێکراوە، قەزاکانی سەلاحیە و هەولێر لە چینی دووەمن، ناوبراوان روشدی ئەفەندی هەڵبژێردراوە، عەبدوڵلا بەگیش هەر چەند هەڵنەبژێردراوە، بەڵام دەتوانرێت بروانامەی مۆڵەتی بەکارهێنانی پێ بدرێت، چونکە تۆمارکراوە کە لە ئەرکی پێشووی چەند خزمەتی باشی کردووە، هەروەها گواستنەوەی ئەرکەکەیان چەند سەرکەوتوو دەبێت و لە بەرژەوەندی دەوڵەت دایە، ئەمەش لە نووسراو ئاماژەی پێکراوە، هەر بۆیە روشدی ئەفەندی بۆ سەلاحییە و عەبدوڵلا بەگیش بۆ هەولێر لە قائیمقامیەتی قەزاکان دامەزرێن و بگوازرێنەوە، لیستی چاکسازی بە گوێرەی ماددەی سێیەم رێکخراوە و بە تەلەگرافنامە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن.




| DH.MKT. | 02194.00078 | 18 زيلحيجه 1316 |
|---|---|---|

١٧ نیسان ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵی پایەبەرز
بـۆ قائیمقامیەتـی سـەڵاحیە، قائیمقامـی هەولێـر روشـدی ئەفەنـدی و لـە شـوێن ئەویـش قائیمقامـی زێبار، عەبدوڵـڵا بـەگ لـە مێـژووی ٢٨ زیلحیجـە ١٣١٦ فەرمـان دراوە بـە دامەزراندنـی، دوای سـوێند خـواردن دەتوانـن دەسـت بـەکار بـن.
نوسراوی سەدری ئەعزەم بۆ ژمێریاری




تلغراف نامه



| DH.TMIK.M. | 00083.00031 | 4 زيلحيجه 1317 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
هەر لە کۆنەوە لە نێوانیان ناکۆکی هەیە و بۆتە هۆکاری تێکدانی ئاسایش و رووداوی یەك لە دوای یەك روو بدات، بۆ رێگری کردن لەم رووداوانە پێویست کراوە لە سەرەتای ساڵەوە یەك تابور سەربازی شاهانە بنێردرێت، بەڵام ئەمرۆ لە سایەی جەنابی پاشاوە پەیوەندی نێوان شێخی بارزان و شێخی بجیل باش بۆتەوە و چاك بۆتەوە، هەروەها هەردوو لا بە هۆی ئەو دەسەڵاتە کاریگەرەی هەیانە لە مورید و هاوەڵانیان یەك تاقم لە هۆزەکان و دانیشتووان بەشدار بوون لەم ناکۆکیە، بەڵام لە سایەی جەنابی خەلافەتپەناهی ئەم ساڵ وەکو بەندە دەمێننەوە، راگەیەندراوە فەرمان.
لە ٢٢ مارت ١٣١٦
حازم والی موسڵ

| DH.ŞFR. | 00239.00052 | 6 ڕەبیعی کۆتایی 1317 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
زێبار کە سەر بە موسڵە، شێخەکەی بە ناوی محەمەد ئەفەندی لە کاتی ڕاکردنی بۆ ئێران، لەلایەن شێخ محەمەد سدیق ئەفەندی لە شەمدینان دەستگیرکراوە، موتەسەرفی هەکاریش ئاگادار کراوەتەوە، چۆنیەتیشی بۆ ویلایەتی موسڵ نووسراوەتەوە، فەرمان، لە ٢ ئۆغستۆس ١٣١٥.
تاهیر والی موسڵ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
239 | 125

DH.ŞFR.00239.00125.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00239.00125</td><td>21 ڕەبیعی کۆتایی 1317</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>لە ١٦ ئۆغستۆس ١٣١٥، لەوە تێگەیشتووین کە شێخی زێبار تا لە شەمدینان بمێنێتەوە لە نێوان هۆزەکان جۆش و خرۆش دروست دەکات، بە گفتوگۆ لەگەڵ موشیری لەشکری چوارەم هێنراوەتە باش قەلعە، لەسەر قسەی سەروو ناوبراو لە ژێر پارێزگاریەکی تەواو سبەی بنێردرێتە وان، هەڵگرتنی لە باش قەلعە بە موتەسەرفی هەکاری بە وەکالەت نووسراوە و راگەیەندراوە، فەرمان، لە ١٧ ئۆغستۆس ١٣١٥.<br><br>تاهیر والی وان</td></tr>
</table>

DH.ŞFR.00240.00010.001

| DH.ŞFR. | 00240.00010 | 24 ڕەبیعی کۆتایی 1317 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
لــە تەلەگرافنامــەی بەندەمــان لــە مێــژووی ١٧ ئۆغســتۆس ١٣١٥ شــێخی زێبــار ئەمــرۆ گەیشــتە وان، ڕاگەیەنــدراوە بــۆ فەرمــان.

لە ٢٠ ئۆغستۆس ١٣١٥
تاهیر والی موسڵ




DH.ŞFR.00240.00034.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00240.00034</td><td>29 رەبیعی کۆتایی 1317</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>هاوپێچی تەلەگرافنامەی بەندەمان لە مێژووی ٢٠ ئۆغستۆس ١٣١٥ لە موشیریەتی لەشکری چوارەمی هومایۆنی جەلیلە بە گوێرەی ئەو ئاماژەیەی کە هاتووە شێخی زێبار لە رێگەی بەتلیس بەرەو موسڵ بەرێکەوتووە، ئەمرۆ دەرچوو لە رێگایە، راگەیەندراوە، فەرمان، لە ٢٥ ئۆغستۆس ١٣١٥.<br>تاهیر والی وان</td></tr>
</table>

DH.ŞFR.00240.00089.001

| DH.ŞFR. | 00240.00089 | 13 جەمادی یەكەم 1317 |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لـە ٥ ئەیلـوول ١٣١٥ شـێخ محەمـەد ئەفەنـدی راسـتەوخۆ لەسـەر فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا بـۆ قەزای زێبـار دەروات، بەمـەش رەتكردنـەوەی رۆیشـتنی لـە ویلایەتـی بەتلیـس ئاماژەی پێكـراوە، فەرمـان، لـە ٧ ئەیلـوول ١٣١٥.<br>حازم والی موسڵ | | |


İ.DH.01370

| I.DH. | 01370.000045 | 15 رەجەب 1317 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
٢٠٧٥
بۆ جەنابی بەرێزیان
لە ویلایەتی موسڵ قائیمقامیەتی قەزای زێبار شوێنەکەی بەتاڵە، بە مەبەستی دامەزراندنی قائیمقامی قەزای زێبار، قائیمقامی قەزای دهۆك بگوازرێتەوە و دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە داواکاری پێشکەش کراوە، لەگەڵ ئەو داواکاریە و کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە بارەی جێبەجێ کردنیشی بە فەرمانی پاشا جەنابی خەلافەتپەناهی چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت، لە ١٥ رەجەب ١٣١٧ و ٧ تشرینی دووەم ١٣١٥.
سەدری ئەعزەم



| 4 موحەررەم 1317 | 02203.00014 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٤ موحەررەم ١٣١٧
٣ مایس ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی قەزای زێبار عەلی رزا ئەفەندی خوالێخۆشبوو مووچەی کۆکراوەی دەدرێتە میراتگری، لەم بارەیەوە بۆ ناردنی سەنەدەکان، نووسراو لە نەزارەت بۆ ویلایەت نووسراوە، لە مێژووی ٨ کانوونی دووەم ١٣١٧ دووپاتکراوەتەوە کە بەهۆی خراپی حاڵی میراتگرەکەی لەسەر واژووی داواکاری وەکیلی کوڕی خوالێخۆشبوو عەلی رزا پێشکەشی سەدارەتپەناهی کراوە، ئەو داواکاریەی نێردراوە، لەسەر داواکاری و ئاماژەی پێشوو جێبەجێ بکرێت.




| 2 سەفەر 1317 | 02209.00138 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٤ موحەررەم ١٣١٧
٣ مایس ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی قەزای زێبار عەلی رزا ئەفەندی خوالێخۆشبوو مووچەی کۆکراوەی لێرە دەدرێتە میراتگری، لەم بارەیەوە بۆ ناردنی سەنەدەکان نووسراو لە نەزارەت بۆ ویلایەت نووسراوە، لە مێژووی ٨ کانوونی دووەم ١٣١٧ دووپاتکراوەتەوە کە بەهۆی خراپی حاڵی میراتگرەکەی لەسەر واژووی داواکاری وەکیلی کوری خوالێخۆشبوو عەلی رزا پێشکەشی سەدارەتپەناهی کراوە، ئەو داواکاریەی نێردراوە، لەسەر داواکاری و ئاماژەی پێشوو جێبەجێ بکرێت.



| 2 جەمادی یەکەم 1317 | 02244.00016 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ جەمادی یەکەم ١٣١٧
٢٦ ئۆغستۆس ١٣١٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
بـۆ کۆتایـی هێنـان بە شـێخی بـارزان محەمـەد ئەفەنـدی، بـە بیرۆکەی دەسـتدرێژی کردنە سـەر شـەمدینان لـە زێبـار نزیکـەی ١٠٠٠ کـەس کۆبوونەتـەوە و چۆنەتـە وان، دواتـر پەرشـوبڵاوبوونەتەوە، ئەگـەر گەرانـەوە شـوێنی خۆیـان، ئـەوا دووبـارە بـە ڕێگـەی بەتلیـس و سـەعرد جولەیـان کـردووە تـا بگەرێنـەوە موسـڵ، بـە قوماندانیەتـی ویلایەتـی وان راگەیەنـدراوە، لـە موسـڵ برێکـی تـەواو هێز چۆتـە جەزیرە، لەشـکری چوارەمی هوماپـۆن ئـاگادار کراوەتـەوە کـە ئـەو هێـزە بگەرێتـەوە موسـڵ، بـەو شـێوەیە پێویسـتە ناوبـراو نەگەرێتەوە موسـڵ، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە مێـژووی ٢٤ ئۆغسـتۆس ١٣١٥ لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە پێشـکەش کـراوە، بـۆ وەرگرتنـی رەزامەنـدی.



| 23 جەمادی كۆتایی 1317 | 02262.00116 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٣ جەمادی كۆتایی ١٣١٧
١٦ تشرینی یەكەم ١٣١٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی دهـۆك، عەلـی بـەگ دوای لێكۆڵینـەوە لـە مامەڵەكـەی هیـچ شـتێك لەسـەری نەدۆزرایـەوە، بەم تێروانینـە ئەگـەر بكرێـت دەتوانـێ بگەڕێتەوە سـەر كارەكەی، بـەڵام واباشـترە بگوازرێتەوە بـۆ قائیمقامیەتی زێبـار، هەروەهـا لـە سـەر ڕەزامەنـدی خـۆی لـە كاتـی ڕۆیشـتنی بـۆ ئـەوێ، بـۆ قائیمقامیەتـی دهۆكیـش، سـاڵح سـەعدی ئەفەنـدی دابمەزرێـت، بـە گوێـرەی نـوسراو و تەلەگرافنامـە كـە لـە ویلایەتـی موسـڵ وەرگیـراوە، جێبەجـێ بكرێـت، هەروەهـا دەركەوتـووە لـە قـەزای زێبـار لـە چینـی سـێیەم و بـۆ یەكـەم جاریـش ئەركەكـەی گواسـتۆتەوە بـۆ قائیمقامـی هەولێـر، ناوبـراو نـووسراوی هاوپێـچ لـە چینـی سـێیەم بـۆ قائیمقامیەتـی زێبـار هەڵبژێـردراوە و پێشـكەش كـراوە، هەرچـی سـاڵح سـەعدی ئەفەندییـە ئەركەكـەی و هەڵبژاردنـی پەسـەند نەكـراوە، لـە دهـۆك كەسـێكی گونجـاو دەسـت نیشـان بكرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە رابگەیەندرێـت.




DH.MKT.02289.00081.001

| 1317 شەعبان 23 | 02289.00081 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٣ شەعبان ١٣١٧
١٤ کانوونی یەکەم ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
بە تەلەگراف ئاماژەی پێکراوە، کە عەلی بەگ بۆ قائیمقامی قەزای زێبار لە ویلایەت ئەرکەکەی پێ سپێردراوە، ئەگەرچی بۆ شوێنی کارەکەی رۆیشتووە، بە گوێرەی نیزامنامەی تایبەت ماددەی ٢١ سەبارەت بە دانانی فەرمانبەر و دوورخستنەوەیان بە باس کردنی هۆکارەکان لە قۆمیسیۆن ووردبینی بۆ نەکراوە، بۆیە کارەکەیان پەسەند ناکرێت، هەروەها گواستنەوەی ئەرکەکەی کۆتایی پێهاتووە، هەر خۆشی قەبول کردنی ئەرکەکەیان بە وەڵامی نەزارەت بە شوێنەکانیان رانەگەیەندراوە، بۆیە جولەیان لە شوێنی خۆیان گونجاو نییە، ئەمەش نووسراوەتەوە، بۆ دووبارەنەبوونەوەی ئەم جۆرە مامەڵە و بارودۆخە سەرپێچیکەرانە، ئاگاداری لە ویلایەت هاتووە، هەروەها ناوبراو لەکاتی ئامادەبوونی لە قائیمقامیەتی قەزای سەماوە، سکاڵای لەسەر تۆمار کراوە، بۆیە بەکار هێنانەوەی گونجاو نییە، ئەمجارە لە ئاگادارکردنەوەی پێشوو لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرایەتی مولکیە کۆمەڵێک نووسراو دۆزراوەتەوە، نووسراو لە مێژووی ٢ کانوونی یەکەم ١٣١٥ ژمارە ٢٨٩٧ نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردن.



DH.MKT.02307.00113.001

| 1317 شەوال 18 | 02307.00113 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٨ شەوال ١٣١٧
٦ شوبات ١٣١٥
بۆ ویلایەتی موسڵ
بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار عەلی بەگ دامەزراوە، هەر لەگەڵ دەست بەکار بوونی لە کارەکەی مانگانە ١٢٢٥ بۆ دەبردرێتەوە، لەگەڵ دەست بەکار بوونی بە گوێرەی بڕیاری نیزامنامە کارەکان جێبەجێ دەکرێت و لەگەڵ دەست بەکاربوونیشی لە ئەرکی پێشووی لە مێژووی دەست لە کار کێشانەوەی بە ووتەی ژمێریاری ڕاگەیەندرا.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2313 22

DH.MKT.02313.00022.001

| DH.MKT. | 02313.00022 | 2 زيلحيجه 1317 |
|---|---|---|

٢ زيلحيجە ١٣١٧
١٩ شوبات ١٣١٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە پریشتەنی گوندی زێبار لە سەر بابەتی کچێك رووبەرووبوونەوە روویداوە، ٥ کەس کوژراوە، هەروەها ٦ کەسیش بریندار بووە، لە شوێن خۆی راگەیەندراوە، موتەسەرفی پریشتەن ئاگادار کراوەتەوە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و ئەوانەی هۆکار بوون دەستگیر بکرێن، لەسەر ئەو بابەتە لە نێوان گوندەکان گفتوگۆ کراوە، بۆ ئەوەی ئەو رووداوە خراپە بەلایەك چارەسەر بکرێت، لەسەر کارەکانی قۆمیسیۆن کە لە پریشتەپی جولەی کردووە، لە بەرامبەر ئەوەدا مەلا سولو لەگەڵ خەواجەی گوندی کەنشنە و ئەوانەی لەگەڵی بوونە ٨٠٠ کەس کۆبوونەتەوە و چەکیان هەڵگرتووە، بۆ هاوکاری قۆمیسیۆنیش لە پریشتنە و لایەکانی تر ٥٠٠ کەس خەریکی رۆیشتنن، لە وەڵامدا بە موتەسەرفی وەکالەت ووتراوە، بۆ ئامۆژگاری و ئاگادارکردنەوەی پێویست مەلا سولو ئەوانەی هۆکاری ئەو کارە بوونە بۆ تەمبێ کردنیان لەلایەن حکوومەتەوە، بە ماوەی ١٠ رۆژ ئەو کۆمەڵەیە پەرشوبڵاو کراونەتەوە و رێگە نەدراوە بە تێکچوونی بارودۆخەکە، هەروەها راگەیەندراوە لە ماوەی چەند رۆژێکدا کار دەکرێت بۆ چاك کردنی نێوانیان، کە لە زیان زیاتر هیچ شتێك بەدوای خۆیدا ناهێنێت، هەروەها سوودی قۆمیسیۆنەکانیش نەبینراوە، پێویستە هەڵبوەشێنەوە، لە مێژووی ١٤ شوبات ١٣١٥ تەلەگرافنامە لە ویلایەت پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردن.

DH.ŞFR.00248.00006.001

| DH.ŞFR. | 00248.00006 | 5 سەفەر 1318 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ٨ مایس ١٣١٦ بۆ ئاشت کردنەوەی نێوانی شێخ سدیق ئەفەندی و شێخی بارزان محەمەد ئەفەندی بە هەواڵدان و قسە کردن لە ویلایەت، لێرە و لەوێ فەرمانبەر بە رێککەوتن دامەزرێت، بە کۆکردنەوەی ئەو لایەنانە قسەیان لەگەڵ بکرێت، هەروەها ئەنجامەکەشی رادەگەیەندرێت، لە ٢٢ مایس ١٣١٦.
حازم والی موسڵ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2372 33

DH.MKT.02372.00033.001

| 13 ڕەبیعی یەکەم 1318 | 02372.00033 | DH.MKT. |
| --- | --- | --- |

١٣ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٨
٢٧ حوزەیران ١٣١٦
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لـە ویلایەتـی ڕۆژئـاوای تەرابلـوس قـەزای غاریـان قائیمقـام حەسـەن عیلمـی ئەفەنـدی بـۆ قـەزای مـسرات گوازراوەتـەوە، بەهـۆی هەندێـك هـۆكاری بەربەسـت رایگەیانـدووە كە ماوەیەك پێویسـتی بـە پشـوودانە، هەروەها ناكرێـت قـەزای باسـكراو ماوەیەكـی درێـژ بـە كراوەیـی بەجـێ بهێڵدرێـت، بۆیـە دوور بخرێتـەوە و لـە شـوێن ئـەو یەكێكـی تـر دابمەزرێـت، ئـەو نووسراوانـەی لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو نووسراوەتـەوە، لـە كۆتاییـدا ناوبـراو شـوێنی ئەركەكـەی بەجـێ هێشـتووە و هاتۆتـە دەرسـەعادەت بـە لێكۆڵینـەوە دەركەوتـووە ناوبـراو لە قائیمقامیەتـی قەزای غاریـان لەلایـەن جەنابـی خەلافەتپەناهـی بـە فەرمانـی پاشـا ئەركـی دراوەتـی، بـە نـووسراو بـاش كیتابەتـی جەنابی ملوكانـەی هومایـۆن ئـاگاداری دراوە، هەروەهـا لـە چینـی یەكـەم قائیمقامـی پێشـووی زێبـار مسـتەفا نەجاتـی ئەفەنـدی لـەوێ دابمەزرێـت، كاغـەزی وەرگێـراو لەگـەڵ نـووسراوی ناوهاتـوو پێشـكەش كـراوە، بـۆ جێبەجـێ كردنی رای سـەروو وەكالەتپەناهیـە.




DH.MKT.02381.00030.001

| 2 رەبیعی کۆتایی 1318 | 02381.00030 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٨
١٦ تەمموز ١٣١٦
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
مزوری باڵا کە سەر بە قەزای زێبارە کرێی ئەو زەوییانەی کە بۆ کەسانێك جیاکراوەتەوە، لە کاتی کۆکردنەوەی کرێیەکەی لەلایەن قائیمقامی قەزای ناوبراو محەمەد عەلی بەشێوەیەکی خراپ پارەکە بەکاردەهێنێت و ئەو لێکۆڵینەوە سەرەتاییەی لەسەری کراوە، کاغەزەکان نێردراوە، ئەو نووسراوەی لە مێژووی ١٠ حوزەیران ١٣١٦ ژمارە ٣٥ لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە پێشکەش کراوە، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، راوبۆچوونیش بۆ سەدارەتپەناهیە.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2399 54

DH.MKT.02399.00054.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02399.00054</td><td>10 جەمادی یەکەم 1318</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٠ جەمادی یەکەم ١٣١٨<br>٢ ئۆغستۆس ١٣١٦<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>بەهۆی ئەو خزمەتانەی لە پێشوودا کردوویەتی، داواکراوە لە بەڕێوەبەرایەتی یەکێك لە ناحیەکانی ناو ویلایەت دابمەزرێت، لەلایەن تەحسیلداری (تحصیلدار) سوارە لە قەزای زێبار حاجی عەبدولباقی ئەفەندی داواکاری پێشکەشی سەدارەتپەناهی کراوە، لەگەڵ ئەوە نووسراو بۆ پایەبەرز ڕۆیشتووە، هەروەها ئەگەرچی ناوبراو لە دەرچووانی مەکتەب نییە، بۆیە بە گوێرەی نیزام بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناحیە گونجاو نییە، بە تێروانین لە داواکردنەکە لەوێ لە خزمەتی جۆراوجۆر و بە وەکالەت لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیە کاری کردووە، بە گوێرەی ئەو تێگەیشتنە حاڵێك نییە لەوەی ڕێگری بکرێت لە دامەزراندنی، لە ئەنجامدا بۆ دامەزراندنی لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەیەك، لە سەروو هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>



DH.MKT.02405.00103.001

| DH.MKT. | 02405.00103 | 27 جەمادی یەکەم 1318 |
|---|---|---|

٢٧ جەمادی یەکەم ١٣١٨
٩ ئەیلوول ١٣١٦
بۆ ویلایەتی موسڵ و وان

ماوەی دوو ساڵە لەلایەن چەتەکانەوە دووچاری پەلامار بوونەتەوە، ئەو فەرمانبەرانەی کە لە ویلایەتی موسڵ و وان بۆ ناوچەکە رۆیشتوون، بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکانیان کە کردوویانە، لەگەڵ ئەوەی کارەکانیان پەسەند کراوە، کەچی بەهۆی بوێریکردنیانەوە تەمبێ نەکراون، لە کۆتاییدا پیاوەکانی شێخی بارزان محەمەد ئەفەندی لەگەڵ بەگزادەکانی برادۆست، لەلایەکی تر بە هاندانی یەکێك لە میرەکانی ئێران ئاغا خان لەگەڵ هەردوو هۆز، لەلایەن هاوەڵانی سەرهەنگ مەحمود بەگ کە لە مەرکواردە نیشتەجێیە، کەلوپەل و مەڕوماڵاتیان تاڵان کردووە، هەروەها پیاوەکانیان کوشتووە و برینداریان کردووە، رێگاکان داخراون، زەخیرە بۆ ناو قەزا نایەت، لەبەر ئەوە بۆ سەر سنوور برێکی باش سەربازی شاهانە نیشتەجێ بکرێت، جگە لەوە رێگاکان بپارێزرێن و کەلوپەلە دزراوەکان بگەرێندرێتەوە و بوێریکەران تەمبێ بکرێن، بۆ ئەم داواکاریانە لە شەمدینان واژووی جۆراوجۆر کۆکراوەتەوە و بە تەلەگرافنامە نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنیشی لە نەزارەتی دەرەوە نووسراو لە ٢٤ ئۆغستۆس ١٣١٦ ئاماژەی پێکراوە، هەروەها تەلەگرافنامەی باسکراو هاوپێچ نێردراوە، چۆنیەتی جێبەجێ کردنیشی لە ویلایەتی ناوهاتوو نووسراو کراوە، لەوێش دوا لێکۆڵینەوە کاری پێویست بکرێت و دواتریش لە ئەنجامەکەی زانیاری بدرێت.



| 1318 جەمادی کۆتایی 23 | 02415.00133 | DH.MKT. |
|---|---|---|

٢٣ جەمادی کۆتایی ١٣١٨
٥ تشرینی یەکەم ١٣١٦
بۆ ویلایەتی موسڵ
عساف بەگ قائیمقامی پێشووی زێبار بە تەلەگراف داوای کردووە لە شوێنێك بە قائیمقام دابمەزرێت، لەبەر بارودۆخەکەی ناوبراو گونجاو نییە لە قەزای زێبار لەم ئەرکە بەردەوام بێت، ئەمەش بە پەیوەندیدارانی سەروو راگەیەندراوە، لە مێژووی ٤ ئۆغستۆس ١٣١٣ دەستی لە کار کێشاوەتەوە، بە تۆمار دەرکەوتووە هەروەها لە نەزارەت زانیارییەکان رێکخستنی بۆ دەکرێت، دواتریش جێبەجێ دەکرێت، لە یەکەم فەرماندا بە پشت بەستن بە بەرائەتی شورای دەوڵەت پێویستە بریاری لەسەر بدرێت، بە ئاگادار کردنەوەی ناوبراویش دەست بە کارەکە دەکرێت.



DH.MKT.02456.00058.001

<table>
<tr><td>DH.MKT.</td><td>02456.00058</td><td>11 زیلحیجه 1318</td></tr>
<tr><td colspan="3">١١ زیلحیجه ١٣١٨<br>١٧ شوبات ١٣١٦<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە مێژووی ٣٠ تشرینی دووەم ١٣١٦ ژمارە ٨٢ وەڵامی نووسراوی سەرووە، قائیمقامی قەزای زێبار، کۆچکردوو عەلی رزا ئەفەندی ئەو مووچەی هەیەتی، نیوەی مووچەکەی و ٥٪ی، کە دەکاتە ١٨٥٤ قوروش و نیو رادەستی کوڕەکەی مولازی دووەم عەلی رزا ئەفەندی لەگەڵ سەنەدەکەی بەیەکەوە دراوەتە میراتگری.</td></tr>
</table>




| I.HUS. | 00092.00009 | 6 رەمەزان 1319 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٦٧٨٥
پێش ١٧ ساڵ لە زیندانی موسڵ زیندانی کراوە و لە دادگای پێداچوونەوە تا ئێستا ووردبینی کاغەزەکانی تەواو نەبووە، خضر کوری سەمەد زێباری، لە ماوەی زیندانیەکەی بۆ یەك رۆژیش بێت کاری خراپی نەکردووە و کاری نەگونجاوی نەبینراوە، بەهۆی مافی گشتییەوە لەبارەی لێخۆشبوونی سەروو بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی لێخۆشبوون بیگرێتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٦ رەمەزان ١٣١٩ و لە ٤ کانوونی یەکەم ١٣١٧.
جەنابی شەهریاری سەر کاتیب



| DH.TMIK.M. | 00113.00047 | 26 ڕەجەب 1319 |
|---|---|---|
| ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٧<br>بۆ ویلایەتی وان<br>(شیفره)<br>شێخ سدیق ئەفەندی شەمدینانی لەگەڵ ٢٠٠ لە هاوەڵانی هێرشیان کردۆتە گوندەکانی هەنکە و پەتەر سەر بە برادۆست، ١٩٠٠ سەر مەڕ و ٢٠ سەر بارگیریان تاڵان کردووە، دوو پیاو و یەك ئافرەتیان کوشتووە و تاڵانکراوەکانیان بۆ قەزای نەهری بردووە، هەروەها نزیکەی ١٨٠ کەس لە گوندی پەتەر ماونەتەوە نازانرێت چ بیرۆکەیەکیان هەیە، هەروەها ناوبراوان یەکەم جار و ئەمجارە ئەو شتانەی تاڵانیان کردووە، بۆ وەرگرتنەوەیان و تۆڵەسەندنەوە، برادۆستیەکانی ناچار کردووە یارمەتی شێخی بارزان وەربگرن، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە، نووسراوەتەوە بەپەلە تاڵانکراوەکان بگەڕێندرێتەوە و ڕێگە نەدرێت جارێکی تر کاری ئاوا ڕووبداتەوە. | | |



| DH.TMIK.M. | 00119.00048 | 25 زیلقەعدە 1319 |
|---|---|---|

مامەڵەی بەپەلە
٢٥ زیلقەعدە ١٣١٩
٢١ شوبات ١٣١٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
بەهۆی لێخۆشبوونیان بە مەبەستی سوپاس کردن لە نەوەکانی شێخ نوری ئەفەندی، لەوانە محەمەد نوری ئەفەندی لەگەڵ نور محەمەد ئەفەندی هاتوونەتە مەکەزی ویلایەت دوای وەرگرتنی ئامۆژگاری پێویست لەلایەن عەلی پاشاوە، هەروەها دوای ئەوەی رایانگەیاندوە کە هیچ کارێکی سەرپێچی و جولەیەکی سەرپێچیکار ناکەن، بەڵێننامەیان پێ دراوە و بەڵێننامەیان پڕ کردۆتەوە کە سەرپێچی ناکەن، لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ١٤ کانوونی یەکەم ١٣١٧ ژمارە ٤٥ بە هاوپێچ و مامەڵەی بەپەلەی قۆمیسیۆن بۆ ماوەی یەك مانگ زانیاری دەدرێتە جەنابی سەدارەتپەناهی، راگەیەندراوە، ئەمر و فەرمان.



| BEO. | 001652.123877 | 7 موحەڕڕەم 1319 |
|---|---|---|

٧ موحەڕڕەم ١٣١٩
١٤ نیسان ١٣١٧
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی موسڵ قائیمقامی قەزای زێبار محەمەد عەلی بەگ بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵی کراوە، بە مەبەستی دادگاییکردنی نێردراوەتە دادگا، لەسەر نووسراوی مێژووی ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣١٨ ژمارە ٢٠٧١ و بە بڕیاری شورای دەوڵەت بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی بڕیاری باسکراو هاوپێچ لەگەڵ وێنەی پەسەندکراوی داواکاری نێردراوە، هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی.

| BEO. | 001764.132253 | 7 رەمەزان 1319 |
|---|---|---|

٧ رەمەزان ١٣١٩
٥ كانوونی یەكەم ١٣١٧
لە نەزارەتی دادوەری جەلیلە بۆ لایەنی سەروو
١٧ ساڵە لە زیندانی موسڵ زیندانی كراوە و لە دادگای پێداچوونەوە هێشتا كاغەزەكانی لە ووردبینی تەواو نەبووە، خضر كوڕی حەمەی زێباری لە ماوەی زیندانیەكەی بۆ یەك ڕۆژیش بێت كاری خراپی نەبینراوە، هەروەها پشت بەستن بە درێژنەكردنەوەی ماوەكەی و ئازادكردنی بە پەیرەوكردنی مافی گشتی بە فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، لەگەڵ ملوكانەی هومایۆنی باش كیتابەتی جەلیلە بە نوسراو باسكراوە و لە ویلایەتی ناوهاتوو بە تەلەگراف جێبەجێ كراوە، لە نەزارەتی جەلیلەش لە جێبەجێ كردن دایە.




| DH.MKT. | 02477.00006 | 5 موحەررەم 1319 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی دەوڵەت
٥ موحەررەم ١٣١٩
١٢ نیسان ١٣١٧
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
مێژووی ٨ مارت ١٣١٧ ژمارە ٢٠ وەڵامی نووسراوی دەستوری سەرووە
عەلی رزا ئەفەندی قائیمقامی قەزای زێبار بووە، دوای مردنی مووچەی قائیمقامیەتی کە ١١٦٨ قوروش بووە، لە شوێن خۆی پۆستە هاتووە، لە سانجەقی پۆلۆ دادگای شەرعی راگەیەندراوی شەرعی دراوە، بە گوێرەی ئەوە رادەستی میراتگری کورەکەی کراوە، لە بەرامبەر ئەوەشدا سەنەدێك لەگەڵ راگەیەندراوی شەرعی وەرگیراوە، لە ١٧ شوبات ١٣١٦ بۆ ویلایەتی موسڵ نێردراوە، بە ووتەی ژمێریاری نووسراوەتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MKT
2487 85

DH.MKT.02487.00085.001

| DH.MKT. | 02487.00085 | 3 سەفەر 1319 |
|---|---|---|

٣ سەفەر ١٣١٩
٨ نیسان ١٣٠٧
بۆ ویلایەتی موسڵ

لە مێژووی ١٠ حوزەیران ١٣١٦ ژمارە ٣٥ وەڵامی نووسراوی پایەدار، قائیمقامی قەزای زێبار محەمەد عەلی بەگ بەهۆی خراپەکاریەکانیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە و بۆ دادگا بانگ کراوە، لەم بارەیەوە بە بریاری شورای دەوڵەت بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی راگەیەندراوە، لە مێژووی ١٧ نیسان ١٣١٧ ژمارە ٥٩ لە نووسراوی سەدری ئەعزەم باسکراوە هەروەها بریاری باس کراویش بە داواکاری لەگەڵ وێنەی پەسەندکراوی بۆ پایەداری سەروو نێردراوە.

DH.MKT.02510.00096.001

| DH.MKT. | 02510.00096 | 28 رەجەب 1319 |
|---|---|---|

٢٨ رەجەب ١٣١٩
٢ تەمموز ١٣١٧
بۆ ویلایەتی موسڵ
لـە بـارەی قائیمقامـی زێبـار محەمـەد عەلـی بـەگ بـە تەلەگرافنامەی ویلایـەت لە مێـژووی ٣٠ مایـس ١٣١٧ داوا کـراوە کاغەزەکانـی لێکۆڵینـەوەی لەسـەر بکرێـت، بەمـەش لـە شـورای دەوڵـەت بـردراوە و هاوپێـچ دراوەتـە سـەروو.




باب عالی
دائرۀ امور داخلیه
مکتوبی قلمی



DH.TMIK.M.00129.00035.001

| DH.TMIK.M. | 00129.00035 | 11 جەمادی یەکەم 1320 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
قائیمقامی عەقرە لەگەڵ بریکاری بەڕێوەبەری زێبار بۆ بەدەست هێنانی پارەوپول لە بنکە ئامادەیی هاوکاری کردنیان نیشان داوە، بە سەرقاڵ بوون بەم دەست کەوتنە و لە خاڵی گونجاودا شوێن خۆیان بگرن، هەروەها لە تەلەگرافنامەکەی تری بە شیفرە لەلایەن بەندەمەوە راگەیەندراوە، شێخ سدیقی شەمدینانی بەهۆی سنوور بەزاندنیەوە بە هۆکاری قەدەغەکردن و ڕێگری کردن ئاغای تابور حەسەن ئاغا لەگەڵ هاوەڵانی بە ٨٠ کەس یەك مەفرەزە سوارەی ئێستر نێردراوە، یەك مانگ زانیاری رادەگەیەندرێت، فەرمان.

لە ٢ ئۆغستۆس ١٣١٨
والی نوری






DH.TMIK.M.00130.00002.001

| DH.TMIK.M. | 00130.00002 | 18 جەمادی یەکەم 1320 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
ئەو تەلەگرافنامەیە بە شیفرەیە کە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
لە ٢ ئۆغستۆس ١٣١٨ ئەو تەلەگرافنامە بە شیفرەیەی کە راگەیەندراوە، لە ژێر کاریگەری مەفرەزەی پۆلیس پیاوەکانی شێخ سدیق و شێخەکانی بارزان و بیجێل کۆمەڵەکەیان پەرشوبڵاوبوونەتەوە، هەر کەسە کشاونەتەوە شوێنی خۆیان هەروەها لەلایەن جەنابی خەلافەتپەناهی بۆ سەروو باسی رووداوەکان نەکراوە، مەفرەزەی پیادە بە کارە گرنگەکەیان سەرقاڵن، فەرمان راگەیەندراوە.

والی موسڵ
٨ ئۆغستۆس ١٣١٨

TÉLÉGRAMME

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie.

| اشارات مخصوصه Indications non taxés | طريق Voies | روز وماشب Matin ou soir | دقيقه Minutes | ساعت Heures | محلی تاریخی Date du dépôt | غروب Group | عدد كلمات Nombre de mots | محلی نومروسی N° du dépôt |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|



DH.ŞFR.00287.00004.001

| DH.ŞFR. | 00287.00004 | 7 ڕەبیعی یەکەم 1320 |
|---|---|---|

گەیشتنی بۆ ناوچەکەی کردۆتەوە بەهانە، بۆیە نێردراوەتە لای شێخ ڕەشید ئەفەندی کوڕی شێخ سدیق ئەفەندی، هەروەها ئەنجامەکەشی ڕاگەیەندراوە، فەرمان.

١ حوزەیران ١٣١٨
تاهیر والی وان

DH.ŞFR.00289.00135.001

| DH.ŞFR. | 00289.00135 | 10 جەمادی یەکەم 1320 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

قائیمقامی عەقرە لەگەڵ بریکاری بەرێوەبەری زێبار بۆ وەرگرتنی پارەوپول لە بنکە هاوکاری خۆیان نیشان داوە، هەروەها تەلەگرافی بە شیفرەکەی تری بەندەمان راگەیەندراوە، بۆ رێگری کردن لە سنور بەزاندنەکانی شێخ سدیقی شەمدینانی، ئاغای تابور حەسەن ئاغا بە هاوەڵی ٨٠ کەس مەفرەزەیەك سوارەی ئێستر نێردراوە، زانیاریەکان رادەگەیەندرێت، فەرمان.

لە ٢ ئۆغستۆس ١٣١٨
نوری والی موسڵ

DH.ŞFR.00290.00048.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00290.00048</td><td>16 جەمادی یەکەم 1320</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٨ ئۆغستۆس ١٣١٨<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ٢ ئۆغستۆس ١٣١٨ تەلەگرافنامەی بە شیفرە راگەیەندراوە، لە ژێر کاریگەری مەفرەزەی پۆلیس کۆمەڵەی پیاوەکانی شێخ سدیق و شێخی بارزان و بیجیل پەرشوبڵاوبوونەتەوە، هەر یەکە کشاونەتەوە بۆ شوێن و ماڵی خۆی، لە سایەی جەنابی خەلافەتپەناهی لایەنی سەروو لە رووداوەکە ئاگادار نەکراوەتەوە، داهاتی مەفرەزەی پیادەش بە کاری گرنگەوە خەریك بووە، راگەیەندراوە، فەرمان.<br>نوری والی موسڵ</td></tr>
</table>

نمونه ۱

TÉLÉGRAMME

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie.

| اشارات مخصوصه Indications non taxés | طريق Voies | روز وياشب Matin ou soir | دقيقه Minutes | ساعت Heures | محلى تاريخى Date du dépôt | غروب Group | عدد كلمات Nombre de mots | محلى نومروسى N° du dépôt |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|



| DH.ŞFR. | 00294.00107 | 8 ڕەجەب 1320 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>لە ٢٢ ئۆغستۆس ١٣١٨ دوای مامەڵەی باشی نێوان کوردە نەستوریەکانی جۆلەمێرگ، بە پێی شوێنەکانیان ئاشت بوونەوەیان پێویست بوو و ئامادەکاریشی بۆ کراوە، هەرچی ئەنجامەکەیەتی رادەگەیەندرێت، هەروەها لە بارەی ویلایەتی بەتلیس و قەزاکانی بەرواری و زێبار لە مێژووی ١٨ مایس ١٣١٨ بە تەلەگرافنامە فەرمان دراوە ئاژەڵەکان وەرگیراونەتەوە و دەدرێنەوە خاوەنەکانیان، ئەمەش لە شوێن خۆی رادەگەیەندرێت، لە ٢٨ ئەیلوول ١٣١٨.<br>تاهیر والی وان | | |




تلغراف نامه



DH.ŞFR.00335.00032.001

| 18 جەمادی یەکەم 1322 | 00335.00032 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە ١٢ تشرینی یەکەم ١٣٢٠، ٣٠ ئۆغستۆس ١٣٢٠ بە تەلەگراف راگەیەندراوە، بەڕێوەبەرایەتیەکە بەتاڵە، غەریب ئەفەندی لە زێبار لەم بەڕێوەبەرایەتیە دامەزراوە و بۆ ئەو شوێنە ڕۆیشتووە، بەڵام بەهۆی بوونی گلەیی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لێی وەرگیراوەتەوە، لەبەر ئەوەیە ئەمرۆ کەس لەم بەڕێوەبەرایەتیە نییە، بۆ فەرمان راگەیەندراوە، لە ١٨ تشرینی یەکەم ١٣٢٠.

فەخری بریکاری والی بەسڕا



BEO.001913.143424.002

| 20 جەمادی یەکەم 1320 | 001913.143424 | BEO. |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
دیوانی دارایی
ژمارە ١٨٦٣
لە نەزارەتی ناوەخۆ بۆ شورای دەوڵەت حەواڵە بووە، نووسراو لە مێژووی ١٦ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ ژمارە ٢٥١٣ لە فەرمانگەی دارایی خوێندرایەوە
بە تێروانین لە بارزانی شێخ محەمەد ئەفەندی و شێخ سدیق ئەفەندی شەمدینانی، بۆ چاککردنەوەی پەیوەندی نێوانیان فەرمانبەر نێردراوەتە شەمدینان، قائیمقامی عەقرە سالح پاشا لەگەڵ ٨ کەسی پۆلیس بە هاوەڵی کردنی رۆیشتوون، لە ناو ویلایەتی وان تا ماوەی دوو مانگ پۆلیسەکان لەوێ بوون، لەگەڵ ئەوەی خەرجیان رێکخراوە، بە گشتی خەرجیەکە بە یەکلاییکەرەوە ٥٠٠٠ قوروش لە ویلایەتی موسڵ رێکخراوە، هەروەها ئاماژە کردن بە مەبەستی لێکۆڵینەوە یاخود بە هۆکارێکی تر بۆ شوێنێکی تر دەروات بە گشتی بە بریارنامەی خەرجی رێگای فەرمانبەران پێویستە ئەو خەرجی رێگایە خەرج بکرێت، ئەگەر بەشی نەکرد بۆ وەرگرتنی خەرجی رێگاکە ئەوا لێکۆڵینەوە دەکرێت و برەکەی لە شوێنی خۆی دەکرێت بە بریار، ئینجا بۆ مۆڵەت وەرگرتنەکەش بە بریار دەدرێت، بۆ جێبەجێ کردنی لە نەزارەتی ناوبراو نووسراو حەواڵە کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٠ جەمادی یەکەم ١٣٢٠ و لە ١٢ ئۆغستۆس ١٣١٨.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)
OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2719 | 47
ŞD.02719.00047.001

| 20 جەمادی یەکەم 1320 | 02719.00047 | ŞD. |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
مامەڵەی بەپەلەی قۆمیسیۆن
ژمارە ۲۵۱۳
جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندە
شێخ محەمەد ئەفەندی بارزانی و شێخ سدیق ئەفەندی شەمدینانی بۆ چاککردنەوەی بارودۆخی نێوانیان قائیمقامی عەقرە ساڵح پاشا لەگەڵ هەشت کەس لە هاوەڵانی ئەو ئەرکەیان پێ سپێردراوە و بۆ شەمدینان رۆیشتوون، لە ناو ویلایەتی وان دوو مانگی خەرجی پۆلیسەکانی رێکخستووە، هەرچی خەرجی گشتییە پاشای ناوبراو بە شێوەیەکی یەکلایی کەرەوە ۵۰۰۰ قوروش لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت پەسەند کراوە، لە ویلایەتی موسڵیش بە نووسراو راگەیەندراوە، بە حەواڵە کردنی بۆ ژمێریاری لە پەراوێزی نووسراوەتەوە بۆ لێکۆڵینەوە یاخود بە هۆکارێکی تر بۆ شوێنێکی تر دەروات، بە گشتی بە گوێرەی بریارنامەی خەرجی رێگای فەرمانبەران، ئەو خەرجی رێگایەی کە پێویست بووە بدرێت بە لێکۆڵینەوە دیاری بکرێت کە پێویستە چەند خەرج بکرێت، هەر کە پێویستی کرد خەرجی رێگا دابین بکرێت، ئەوا برەکەی لە شوێنی خۆیدا دەکرێتە بریار و بۆ مۆڵەتەکەشی بە بریاری شورای دەوڵەت نووسراوی سەدری ئەعزەمی سەدارەتپەناهی لە ۸ ئۆغستۆس ۱۳۱۲ نووسراو کراوە، بە مۆڵەتی ژمێریاری و لە مامەڵەی بەپەلەی قۆمیسیۆن باس کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ١٦ رەبیعی کۆتایی ۱۳۲۰ و لە ۹ تەمموز ۱۳۱۸.
نازری کاروباری ناوەخۆ




| 1 زیلقەعدە1321 | 00163.00014 | DH.TMIK.M. |
|---|---|---|

ویلایەتی وان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ۱۳۸
بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
بۆ جەنابی دەوڵەت

ناحیەی هەرکی کوردی سەر بە قەزای شەمدینان لە گوندی شانی شان لەلایەن پیاوەکانی شێخی بارزان محەمەد ئەفەندی سەر بە ویلایەتی موسڵ تووشی پەلامار بۆتەوە، ئەمجارە لە پەلامار و تێکدانەکە لەوێ ئامادە بوونە، لەسەر ووتەی ئەوانەوە ئەو نووسراوانەی لەلایەن موتەسەرفی هەکاری بۆ قائیمقامیەتی شەمدینان نێردراوە، پێشکەشی نەزارەتپەناهی کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

تاهیر والی وان
لە ۱ زیلقەعدە ۱۳۲۱ و لە ۵ کانوونی دووەم ۱۳۱۹



| 15 زیلحیجە 1321 | 00164.00019 | DH.TMIK.M. |
|---|---|---|

١٥ زیلحیجە ١٣٢١
١٩ شوبات ١٣١٩
بۆ ویلایەتی موسڵ
مانگی رابردوو لە کۆتایی مایس ئەو سەربازی شاهانەیەی کە لە لایەنی موسڵ بوونیان هەبوو، ئەنیس بەگ میری ئاڵای لەگەڵ هەندێك لە پیاوەکانی شێخ محەمەد بارزانی کە ناویان نووسراوەتەوە بە هاوکاری ئەوانەوە یەك مەفرەزە سەرباز پێك هیناوە و تێکەڵی کردوون، پەلاماری گوندەکانی داوە، ئەو کەلوپەلانەی کە دیاری کراون تاڵانیان کردووە و پەلاماریان داون، جگە لەوە خانەکانی گوندیان تێك داوە و سووتاندویانە لەگەڵ ئەوەش دەستدرێژیان کردۆتە سەر ئافرەت و پیاوێکیان کوشتووە و کچێکیشیان بریندار کردووە، لەگەڵ بەرز کردنەوەی ئەو بارودۆخە پێداچونەوە هیچ سوودێکی نەبووە، سکاڵا و داواکردن بە ناوی دانیشتووانەوە لە قەزای رواندز ناحیەی شێروان لە گوندی گەلکە بە مۆری مەلا موسای گوندنشین داواکاری نێردراوە، بۆ پەلەکردن لەم مامەڵەیە بە ووتەی قۆمیسیۆن هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، بە تێروانینی ووردەوە ئەوەی نووسراوەتەوە بەپەلە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

DH.TMIK.M.00165.00046.009

| DH.TMIK.M. | 00165.00046 | 29 زیلحیجە 1321 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بـە تێروانیـن لـە تەلەگرافنامـەی قائیمقامیەتی شـەمدینان ئاگاداری کاریگـەر دراوە بـۆ جێبەجێ کردن و ئامـادەکاری، رای سـەرووش بـۆ نەزارەتپەناهیـە، فەرمان، لە ٩ نیسـان ١٣٣٠.

تاهیر والی وان

وێنەیەکیتی
مـاوەی سـاڵێکە بەهـۆی رووداوەکانـی سـەر سـنووری قەزاکەمـان لەلایـەن بەندەمانـەوە راگەیەنـدراوی تێروتەسـەل راگەیەنـدراوە، بـۆ شـێخی بـارزان محەمـەد ئەفەنـدی کوڕەکـەی عەبدولسـەلام و لـە پیاوەکانـی لـە ناحیـەی زێبـار فەقـی عەبدولرەحـمان و ئەحمـەد شـێخ مستەفا شـێروانی و بـرادەری محەمـەد ئاغـا و خـان ئەبـدال لە سـەرکردەی چەتـەکان، ئەمجـارەش زیاتـر لـە ٤٠٠ جانـەوەر چوونەتـە سـەر سـنووری قـەزای شـەمدینان هێرشـیان کردۆتـە سـەر گونـدی شانشـا و ناحیـەی گـەردی و مەڕومـاڵات و کەلوپەلـی دانیشـتووانیان تـاڵان کـردووە و خانەکانیـان سـووتاندووە، هەروەهـا ٩ پیاویـان برینـدار کـردووە و ٤ پیاویـان بـە دیـل گرتـووە و ٥ پیاویشـیان کوشـتووە، بـەم بوێـرەی کـە کردوویانـە کاغـەزی لێکۆڵینـەوەی بەرێوەبەرایەتـی ناحیـەی گـەردی نێـردراوە و لەگـەڵ پشـت راسـت کردنـەوەی لەبـەر ئـەو خیانەتەیـان پێویسـتە یاسـا جێبەجێ بکرێـت، شـتە تاڵانکـراوەکان بگەرێندرێتـەوە، هەروەها سـنووری قەزاکەمـان شـێروان و مـزوری و برادۆسـت و عەقـرە لـە لکێنراوەکانـی رواندزە، لەگـەڵ ناحیەکانـی زێبـار ببەسـترێنەوە بـە یەکـتری و بـە رێکخسـتنی کارگێـری بخرێنـە ژێـر پارێـزگاری کردنـەوە، هەرچـی زووە هۆکارەکانـی چارەسـەر بکرێـن و تاوانبـاران بگیرێـن، بـە پێچەوانـەوە ئـەو هێـرش و پەلامارانـە زیـان بـە دانیشـتووان دەگەیەنێـت و کۆتاییـان نایـەت، گرنگـی ئـەو بابەتـە ئامـاژەی پێکـراوە.

DH.ŞFR.00303.00115.001

| DH.ŞFR. | 00303.00115 | 2 موحەررەم 1321 |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لە ١٣ مارت ١٣١٩ پەلاماردانی زێبار لەلایەن شەمدینانەوە هیچ راستییەکی تێدا نییە، شێخ سدیق لەگەڵ ئەو شوێنەی کە ئاژەڵەکانی خەڵکی شەمدینانی لێیە، نێوانی لەگەڵ زێبار رووبارێکی گەورەی وەکو زاب هەیە، ناتوانن هاتووچۆ بکەن، بۆیە ناتوانرێت پەلاماری یەکتر بدەن، بە گوێرەی ئاماژەپێکردنیەوە، فەرمان.

لە ١٨ مارت ١٣١٩

تاهیر والی وان


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
341 | 22

DH.ŞFR.00341.00022.001

| DH.ŞFR. | 00341.00022 | 27 زيلحيجه 1321 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لـە ٢٨ شـوبات ١٣٢٠ بـۆ شـوێنی خـۆی ئـاگاداری پێویسـت نێـردراوە، بـە گوێـرەی بارودۆخەکـە ئەوانـەی لـەوێ هاتووچـۆ دەکـەن لەگـەڵ شـێخ ئەفەنـدی ڕێککەوتنیان نەبـووە، دوای ئـەوەی بارزانیـەکان لە هەر سـنووربەزاندنێك خۆیـان بـە شـێخ ئەفەنـدی دەبەسـتنەوە، ئەگـەر هاتـوو سـنووربەزێنن لـەم حاڵەتـە لـە بـارەی ڕێگـە نەدانیـان ئـاگاداری ویلایەتـی موسـڵ کراوەتـەوە.

٢ مارت ١٣٢٠

تاهیر والی



| 14 موحەررەم 1321 | 00684.00053 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٤ موحەررەم ١٣٢١
٣٠ مارت ١٣١٩
بۆ ویلایەتی موسڵ
وەڵامی تەلەگرافنامەی مێژووی ١١ شوبات ١٣١٨ سەرووە، ئەو فەرمانبەرانەی لە کاتی ئەرکی فەرمانبەرایەتی خراونەتە ژێر دادگایی کردنەوە، لەو مێژووەی کە لە کارەکانیان قەدەغەکراون، مووچەکانیشیان براوە و دەستگیر کراون، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و دادگایی کردنیاندا بە تەواوەتی بێتاوانیان دەرخراوە و دووبارە گەڕاونەتەوە سەر کارەکانی خۆیان، هەروەها تا ئەو کاتەی بۆ شوێنێکی تر دەگوازرێنەوە یاخود دادەمەزرێن، یاخود بە گوێرەی پێویست دەگۆردرێنەوە، لەو مێژووەی کە مووچەکانیان براوە تا مێژووی ئەو رۆژەی دەگوازرێنەوە و دەگۆردرێنەوە نیوەی مووچەکانیان پێ دەدرێت هەروەها بە بڕیارنامەی خەرجی رێگا، ماددەی شەشەم لەسەریان جێبەجێ دەکرێت، ئەمەش بە فەرمانی پاشای جەنابی فەرمانی پاشا بە پشت بەستن بە ماددەکانی نیزامیە قائیمقامی قەزای زێبار، محەمەد عەلی بەکر بێتاوانی بۆ دەرچووە و بە گوێرەی ماددەی ناوهاتوو لەو مێژووەی کە دەستی لە کارەکەی کێشاوەتەوە، تا ئەو کاتەی دەست بە کارەکەی دەکاتەوە نیوە مووچەی بۆ هەژمار بکرێت و پێی بدرێت، بە ووتەی ژمێریاری راگەیەندراوە.



| DH.MKT. | 00689.00071 | 23 موحەررەم 1321 |
|---|---|---|

٢٣ موحەررەم ١٣٢١
٨ نیسان ١٣١٩
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
لە ناو ویلایەتی موسڵ لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی زێبار، عەبدولفەتاح ئەفەندی دامەزراوە، بۆ خەرجی ڕێگا ١٣٦٤ قوروش و ١٠ پارە لە ساڵی ١٣١٩ لە داهاتی ناوەخۆ خەرج دەکرێت و نێردراوە، بە ووتەی ژمێریاری ڕاگەیەندراوە.

٢١ سەفەر ١٣٢١
٦ مایس ١٣١٩
بۆ ویلایەتی موسڵ
لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی زێبار عەبدولفەتاح ئەفەندی دامەزراوە، بە گوێرەی نووسراوی مێژووی ١٣ شوبات ١٣١٨ ژمارە ١٦٣ پەسەند کراوە، ناوبراو لە مێژووی دەست پێکردنی ئەرکەکەی مانگانە ٤٠٠ قوروش مووچەی بۆ براوەتەوە، لەوێ کارەکە جێبەجێ دەکرێت، هەروەها لەگەڵ مێژووی دەست پێکردنی خزمەتەکەی لێرە خەرجی ڕێگای بۆ ڕێك دەخرێت، بە ووتەی ژمێریاری ڕاگەیەندراوە.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2071 | 155263 | 1

| 18 سەفەر 1321 | 002071.155263 | BEO. |
|---|---|---|

١٨ سەفەر ١٣٢١
٣ مایس ١٣١٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١١ سەفەر ١٣٢١، بابەتی زێبار بە تەواوەتی ڕێکنەخراوە هەروەها هەندێك لە ڕێگا لادراوەکان چاوەڕێی دەرفەتێك دەکەن، هەندێکیشیان بۆ ڕێککەوتن ئامادە نین، لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی جەلیلە ڕاگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ڕاگەیەندراوەش و دەستکەوتنی ئەنجامەکەی موشیرەتی ناوهاتوو بە مەبەستی ڕاگەیاندن نووسراوی مێژووی ١٥ سەفەر ١٣٢١ ژمارە ٧٩٩ ی سەر عەسکەر بۆ دەوڵەت نێردراوە، هەروەها بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردن و کۆتایی هێنان.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.TMIK.S
53 | 47 | 1

DH.TMIK.S.00053.00047.001

| 18 ڕەبیعی یەکەم 1322 | 00053.00047 | DH.TMIK.S. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە
گوایە دانیشتووانی ناحیەی شێروان بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی مۆڵگەی زێبار داوایان بەرزکردۆتەوە و چوونەتە زێبار، ئەگەرچی دانیشتووانی مزوریش بۆ لاسایی کردنەوەی ئەوان و چاودێریکردن لە ڕەواندز ئاگادار کردنەوە نێردراوە، ئەمڕۆ لە لایەنی سەربازی نووسراوی بینباشی ڕەدیفی زێبار دەرکەوتووە شێروانیەکان بۆ زێبار ڕۆیشتوون، هەروەها روون بۆتەوە پەلامار و سنووربەزاندنی شێخ سدیقی جانەوەر بەرەوپێشچووە، لەگەڵ ئەوە موتەسەرفیەتی کەرکووك و قائیمقامیەتی عەقرە ئامۆژگاری پێویست نێردراوە، بۆ ڕێگەگرتن لە شێخی ناوبراو ئاگاداری پێویست بۆ ویلایەتی وان نێردراوە تا کارەکان جێبەجێ بکرێت، فەرمان، لە ١٧ مایس ١٣٢٠.
والی




| DH.TMIK.M. | 00171.00026 | 1 جەمادی کۆتایی 1322 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٦٧
نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت

قـەزای شـەمدینان لـە ناحیـەی گـەردی دانیشـتوانی گوندەکانـی هرکشـك و ئاینـەدار لەلایـەن بارزانیەکانـەوە مەڕوماڵاتیـان و بزنیـان تـاڵان کـراوە، لـە ویلایەتـی وان سـێ پارچـە داواکاری پێشـکەش کـراوە، بـە لێکۆڵینـەوە فەرمانامـەی جەنابـی نەزارەتپەناهـی لـە مێـژووی ٤ مایـس ١٣٢٠ ژمـارە ٤٢ ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەهـا چۆنیەتـی ئاماژە پێکردنەکـە بـە قائیمقامیەتـی عەقـرە راگەیەنـدراوە، ئەمجـارە بـە گوێـرەی ئـەو وەڵامـەی وەرگیـراوە، هاوپێچ نـووسراوی بەڕێوەبەرایەتـی زێبـار و لـە داواکاریەکانـی ناوهاتـوو لـەو مێـژووەی کـە ئاماژەی پێکـراوە، لـە زێباریەکان یـەك تاکـە کـەس نەچۆتـە ناحیـەی گـەردی بـە پێچەوانـەوە ئەگەرچـی شـێخ سـدیقی شـەمدینانی وەکـو جموجۆڵی هەمیشـەی لەگـەڵ خەڵکـی ناحیـەی ناوهاتـوو لەگـەڵ هەندێـك هـۆز بـە یەکگرتوویـی هێرشـیان کردۆتـە سـەر زێبـار، مەفرەزەی نیزامیـە بـە ترسـەوە کشـاونەتەوە، بابەتـی کاری تاڵانـکاری زێباریـەکان هیـچ مانـای نییـە و لـە راسـتییەوە دوورە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەی کـە فەرمـان دەردەکات.

١ جەمادی کۆتایی ١٣٢٢ و ٣١ تەمموز ١٣٢٠
نوری والی موسڵ

| DH.TMIK.M. | 00175.00044 | 14 رەبیعی کۆتایی 1322 |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لـە نـاو موسـڵ فەقـی عەبدولرەحـمان بارزانـی لەگـەڵ ١٠٠ کـەس لـە هاوەڵانـی چۆتـە شـەمدینان لـە گونـدی پەسـکان نیشـتەجێ بـووە، لـە ناحیـە و گونـدەکان بـە کۆمـەڵ دەسـتی بـە تـاڵان و پەلامـاردان کـردووە، هەروەهـا سـووتاندوویەتی، لەگـەڵ موتەسـەرفی هەکاری لە شـەمدینان لەگەڵ شـێخی پاشـا ئاماژەی پێکراوە، لـە بارودۆخێکی ئـاوا نابێـت ڕێگـە بدرێـت ئاسـایش تێـك بدرێـت، هەروەهـا بـە پەلـە دەسـت بـە کار بکرێـت، فەرمـان.
لە ٥ حوزەیران ١٣٢٠
تاهیر والی وان



DH.TMIK.M.00181.00071.001

| DH.TMIK.M. | 00181.00071 | 27 جەمادی کۆتایی 1322 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
شیفرەی ئەو تەلەگرافنامەیە کە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
هاوپێچی وەڵامی تەلەگرافنامەی ٥ تەمموز ١٣٢٠.............. بریکاری قوماندانی ژاندارمە بۆ زێبار نێردراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ئەرکەکەی سەرکەوتوو نەبووە، لەگەڵ موشیری جەلیلە بە گفتوگۆکردن میری ئاڵای سوارە ئەنیس بەگ نێردراوە، بە گوێرەی ئەو ئاگاداری و ئامۆژگاریانەی کە پێشکەشی کراوە، دەرکەوتووە لەبەر زوڵمەکانی قوماندانی ژاندارمە پشتی لێکراوە، ئەو گەردیانەی بەشداری رووداوەکانیان کردووە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە نێوانیان ئەوەی پەیوەستە بە سەربازی شاهانە دوو تفەنگ و چوار قاتور و برێك فیشەك بۆ جەنابی پاشا بە بێ رووداو کۆکراوەتەوە، بە گەیشتنی بۆ مەکەزی ویلایەت رادەستی لایەنی سەربازی کراوەتەوە، لە بارەی هۆکار و بەشەکانی رووداوەکە لەلایەن ناوبراوەوە لەگەڵ ژورناڵی پۆستە پێشکەش کراوە، فەرمان.

نوری والی
لە ٢٥ ئۆغستۆس ١٣٢٠




<table>
<tr><td>DH.TMIK.M.</td><td>00182.00009</td><td>1 رەجەب 1322</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی وان<br>قەڵەمی نووسین ٧٢<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بۆ جەنابی دەوڵەت<br>یەك مانگ پێش ئێستا فەقێ عەبدولرەحمان بارزانی لەگەڵ هاوکارەکەی دەستدرێژیان کردۆتە سەر ناحیەی گەردی، لە قەزای شەمدینانیش ئەو موسەوییانەی لەوێ نیشتەجێن، بایی ٢٠٠ لیرە کەلوپەلیان لەگەڵ ٣٠٠ لیرە پارەیان تالان کراوە، هەروەها ٢ پیاویان کوژراوە، لە بارەی لێکۆڵینەوە لەم کارە دراوەتە حکوومەتی خۆچێی، لە موتەسەرفی هەکاریش داواکاریەکانیان نێردراوە، هاوپێچ پێشکەشی نەزارەتپەناهی کراوە، بە گوێرەی نووسراوەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە داوای هاوکاری کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br><br>لە ٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٢ و لە ٢٦ تەمموز ١٣٢٠<br>تاهیر والی وان</td></tr>
</table>




تلغراف نامه



DH.TMIK.M.00182.00027.001

| 1322 رەجەب 3 | 00182.00027 | DH.TMIK.M. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

شێخ سدیقی شەمدینانی لەگەڵ شێخی محەمەد بارزانی بۆ تۆڵە سەندنەوە لە یەکتر هەردوو لا جانەوەر کۆدەکەنەوە، ئەمە بە قۆماندانیەتی رواندز راگەیەندراوە، بۆ رێگەگرتن لە سنووربەزاندن و سەرپێچیەکانی شێخ محەمەد، ئاگاداری دراوەتە قائیمقامیەتی عەقرە و قۆماندانیەتی ناوهاتوو، جگە لەوە بۆ یەك رۆژیش بێت رێگە نەدراوە شێخ سدیق سەرپێچی بکات، بۆ پەرشوبڵاوکردنەوەی کۆمەڵەکەی لە ویلایەتی وان فەرمان دراوە، راگەیەندراوە.

لە ٢٨ ئۆغستۆس ١٣٢٠
نوری والی موسڵ

DH.TMIK.M.00183.00053.004

| DH.TMIK.M. | 00183.00053 | 29 رەجەب 1322 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لـە ٢٧ ئەیلـوول ١٣٢٠ دانەیـەك تەلەگـراف لەلایـەن سـوڵتان و هاوەڵانـی لـە شـەمدینان هاتـووە، وەرگیـراوە و خوێندراوەتـەوە، شـێخ محەمـەدی بارزانـی لەگـەڵ هەندێـك لـە هـۆزەکان بـە مەبەسـتی تۆڵەسـەندنەوە خـودی خـۆی دەیەوێـت بـۆ شـەمدینان و ناحیەکانـی نیـروە و دەریکنـاری سـەر بـە عەمادیـە بـروات، بـە گوێـرەی ئـەو هەواڵـەی وەرگیـراوە، ئـەو کۆمەڵـەیەی پێکـی هێنـاوە، بـە ڕێگەی مەفرەزەیـەك پێکهێنراوە بـۆ ئەوەی ئـەو کۆمەڵەیە پەرشـوبڵاو بکاتـەوە، لەلایەنـی عەمادیـەش بـە ڕاگەیەنـدراوی ژاندارمـە بینباشـی تۆفیق بـەگ دەرکەوتـووە، فەرمان، لـە ١٣ تشرینـی یەکـەم ١٣٢٠.

نوری والی موسڵ

تلغراف نامه



DH.TMIK.M.00184.00048.001

| DH.TMIK.M. | 00184.00048 | 12 شەعبان 1322 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵ

ئـەو مەفرەزەیـەی لـە شـەمدینانە بـووە لەلایـەن هـۆزی بارزانەوە تفەنگیـان لـێ سـەندراوە و بردوویانە، بـۆ گەڕانەوە و تەمبـێ کردنـی ئەوانـەی بوێـری ئـەو کارەیـان کـردووە، ئـەو هێـزە سـەربازیەی بـۆ ویلایـەت نێـردراوە، تەنیـا چەکەکانیـان گەڕاندۆتـەوە، لـە بـارەی تەمبـێ کردنـی تاوانبـاران نەدۆزراونەتـەوە، بـەم شـێوەیە هەندێکیـان بوێریـان زیـادی کـردووە، دیسـان هاتوونەتـە شـەمدینان لـە سـنووری ناحیـەی گـەردی هەرەشـەیان لـە خەڵـك کـردووە، بـە ئـاگادار کردنـەوەی ویلایەتـی وان بـۆ جێبەجـێ کـردن و ئەنجامەکەشـی لـە قومیسـیۆن قسـەی لەسـەر کـرا.



| 17 شەوال 1322 | 00188.00041 | DH.TMIK.M. |
|---|---|---|

٢ رەجەب ١٣٠٩
٢٠ کانوونی دووەم ١٣٠٧
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی قەزای شەهربازار عەبدولقادر بەگ بەهۆی ئەوەی لە کاتی جموجۆڵی ناپەسەندی پشدەرەکان هیچ کاردانەوەیەکی نەبووە، هەروەها قائیمقامی قەزای زێبار عەبدوڵڵا ئەفەندی بەهۆی خواردنەوەی، مانەوەیان گونجاو نییە، بۆ ئەم مەبەستە بۆ قائیمقامی شەهربازار قائیمقامی رانیە، عەبدولرەحمان بەگ کە لە کارەکەی دوور کەوتۆتەوە، دامەزرێت، بۆ قائیمقامیەتی زێباریش کەسێکی گونجاو هەڵبژێردرێت و مۆڵەتی پێ بدرێت، ئەگەر چی لە ویلایەتی موسڵ ئاماژە بە ئەوە کراوە، بەڵام عەبدولرەحمان بەگ هەڵنەبژێردراوە و ئەوەی تریش خودی خۆی دانەمەزراوە، بۆیە بۆ قائیمقامیەتی شەهربازار لە چینی سێیەم عارف هەڵبژێردراوە و بۆ قائیمقامیەتی زێباریش لە هەمان چیندا حاجی سەعید ئەفەندی هەڵبژێردراوە کە لە قائیمقامیەتی سیلوان دوور کەوتۆتەوە، بۆ دەست کردن بە ئەرکەکانیان نووسراو کراوە، لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەر داواکاری لەگەڵ دوو پارچە نووسراوی وەرگێردراو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردن.

تلغرافنامه





| DH.ŞFR. | 00326.00011 | 2 سەفەر 1322 |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە ٢٠ مارت ١٣٢٠، لە شەمدینان کۆنەبوونەتەوە، کاتێك بارزانیەکان هێرشیان کردۆتە سەر گوندی شاناشان، ئەو کەسانەی بۆ چاودێری رۆیشتوون، دواتر گەراونەتەوە، تەلەگرافنامەی پاشا راگەیەندراوە، لە ٥ نیسان ١٣٢٠.<br>تاهیر والی وان | | |

DH.ŞFR.00328.00121.001

| DH.ŞFR. | 00328.00121 | 15 ڕەبیعی یەکەم 1322 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

گوایە دانیشتووانی ناحیەی شێروان بۆ دووبارە ڕێکخستنەوە کارگێری مۆڵگەی زێبار چوونەتە زێبار، خەڵکی مزوریش لاسایی و چاودێری ئەوانیان کردووە، ئەگەرچی ئەمە لە ڕواندز ڕاگەیەندراوە، ئەمڕۆ لەلایەنی سەربازیەوە نووسراوی بینباشی ڕەدیفی زێبار ڕۆیشتووە، بە گوێرەی ئەو نووسراوانە هۆکاری نەڕۆیشتنی شێروانیەکان بۆ زێبار دەگەڕێتەوە بۆ سنوور بەزاندن و پەلامارەکانی جانەوارەکانی شێخ سدیق، لە موتەسەرفیەتی کەرکووک و قائیمقامیەتی عەقرە ئاگاداری پێویست ڕاگەیەندراوە، جگە لەوەش بۆ ڕاگرتنی دەستدرێژیەکانی شێخی ناوبراو ڕاگەیەندراوی پێویست بە ویلایەتی وان ڕاگەیەندراوە، بۆ جێبەجێکردنی فەرمان.

لە ١٧ مایس ١٣٢٠

نوری والی موسڵ




| 8 رەبیعی کۆتایی 1322 | 00329.00089 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

٧ حوزەیران ١٣٢٠ دوا بەدوای تەلەگرافنامەی بەندەمانە، لە ناحیەی گەردی قازی عەبدولرەحمان ئاغا زێباری لەگەڵ ئەحمەد سوار ئاغا بەیەکەوە سەرقاڵی کوشتنی خەڵك و تاڵان و پەلامار و سوتاندنن، هەروەها هەردووکیان بوێری تاڵان و پەلامار و کوشتنن، میری لیوا شەوقی شێخ پاشا دەرکەوتووە لە دوو لایەوە مەفرەزەکانی رۆیشتووە، لە ئەنجام یەکیان گرتووە، گرنگی کارەکەیان دەستگیرکردنی ئەوانەیە، راگەیەندراوە بۆ پاراستنی ئاسایش ئەوە چارەسەرە، ئەمەش بە فەرمان راگەیەندراوە، لە ٩ حوزەیران ١٣٢٠.

تاهیر والی





| DH.ŞFR. | 00330.00044 | 5 جەمادی یەکەم 1322 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

ئـەم ڕووداوەی دواییـە کـە لـە نێـوان شـەمدینانیەکان و زێباریـەکان ڕوویـداوە، هەنـگاو بـە هەنـگاو ڕاگەیەنـدراوە و ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەهـا لـە ویلایەتـی وان ئـەو هەواڵـەی لـە بـارەی شـێخ سـدیق ئامـاژەی پێکـراوە، وەکیلـی بەگـی ئـاڵای بـۆ لێکۆڵینـەوە چۆتـە ناوچەکـە، شـێخ سـدیق و سـەرکردەی ...... لەگـەڵ هاوەڵەکانـی دراونەتـە دادگای نیزامیـە، فەرمان.

نوری والی موسڵ
لە ٥ تەمموز ١٣٢٠




| 6 موحەررەم 1322 | 00341.00077 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لـە ٧ مـارت ١٣٢١ بارزانیـەکان و شـێروانیەکان لەگـەڵ شـێخ سـدیق بەهـۆی ناکۆکـی نێوانیانـەوە، بـۆ رێگـری کـردن لـەم ناکۆکـی و رووداوانـە، ئەگەرچـی موتەسـەرفیەتی کەرکـووك و قائیمقامیەتـی عەقـرە ئـاگادار کراوەتـەوە، جموجـۆڵـی شـێخ سـدیق و گەندەڵیەکانـی یـەك لـە دوای یەکـە، لـە راگەیەنـدراوی یەکـەم و دووەم فەرمانـی دووبـارە رێکخسـتنەوەی مۆڵگـەی قـەزای زێبـار پێشـکەش کـراوە، لـەم دەورووبـەرەش ناتوانرێـت پۆلیـس دابنرێـت، راگەیەنـدراوە، فەرمـان، لـە ١٠ مـارت ١٣٢٠.

نوری والی موسڵ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2324 | 174263 | 1

2 vrk
(1 sht boş)

<table>
<tr><td>BEO.</td><td>002324.174263</td><td>15 سەفەر 1322</td></tr>
<tr><td colspan="3">١٥ سەفەر ١٣٢٢<br>١٨ نیسان ١٣٢٠<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە بـارەی شـێخ سـدیق ئەفەندی شـەمدینانی و شـێخ محەمەد نـور ئەفەنـدی لەگەڵ برادۆسـتیەکان، لەلایـەن ئـاڵای سـوارەی ٣٤، تۆفیـق بـەگ میـری ئـاڵا، ئەرکـی پـێ سـپێردراوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە کاغـەزەکان لەلایـەن موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی همایـۆن بـۆ لایەنـی سـەر عەسـکەری واڵا نێـردراوە، لەگـەڵ نـووسراوی سـەر عەسـکەری ناوهاتـوو لـە مێـژووی ١٠ سـەفەر ١٣٢٢ ژمـارە ٣٧٣ لـە ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان دوای خوێندنـەوە بـۆ سـەروو نێـردراوە، بـۆ جێبەجـێ کـردن دەخوێندرێتـەوە و دواتـر بـۆ ناردنـەوەی هیممـەت بکرێـت.</td></tr>
</table>


باب عالی
دائرۀ امور داخلیه
مکتوبی قلمی
عدد
١٧٥٩

حضور عالی حضرت صدارت پناهیه



BEO.002354.176513.002

| BEO. | 002354.176513 | 6 رەبیعی کۆتایی 1322 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٧٥٩
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەتانە
بەهـۆی پێویسـتی و تەنگانەییـەوە بـۆ ئـەوەی برێکـی گونجـاوی ئاقچـە بدرێتـە بریـکاری قائیمقامـی پێشـووی زێبـار ئەدیـب گەوهـەر ئەفەنـدی، لەلایـەن ناوبـراوەوە داواکاری تـکا نێـردراوە، هەروەهـا ناوبـراو لەبـەر هـەژاری و تەنگانەییـەوە جێـگای بەزەییـە، ئـەوەی رێکخـراوە ١٠٠ قوروشـی بدرێتـێ، رای جەنابـی سـەدارەتپەناهیە، ئەمـرو فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٦ رەبیعـی کۆتایـی ١٣٢٢ و لـە ٧ حوزەیـران ١٣٢٠.
نازری کاروباری ناوەخۆ



| 7 سەفەر 1323 | 00057.00040 | DH.TMIK.S. |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لەبەر رەتکردنەوەی قەزای زێبار ماوەی سێ ساڵە بە هیچ شوێنێکەوە پەیوەست نییە، دانیشتوانی دەورووبەری هەموو رۆژ داوا دەکەن بە قەزایەك بلکێنرێن، هەروەها بە هۆی دووری ناوچەکە بە هیچ قەزایەك پەیوەندیان نییە، بۆیە نەتوانراوە لە رووی کارگێریەوە رێك بخرێت و جێگیر بکرێت، خەڵکەکەی تووشی پەرشوبڵاوی و پەرێشانی بوونەتەوە، لەبەر ئەوە لە خەزینەی داهاتی جەلیلە پێشەکی پشت بەستن بە نووسراوی مێژووی ٢٧ مایس ١٣٢٠ ژمارە ٣٨ فەرمانی دووبارە رێکخستنەوەی وەکو قەزا بە تەلەگراف نێردراوە، بە ووتەی ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت بە هاوکاری نەزارەتپەناهی تکا کراوە، فەرمان، لە ١٧ مارت ١٣٢١.
نوری والی موسڵ



DH.TMIK.M.00193.00028.001

| DH.TMIK.M. | 00193.00028 | 6 موحەررەم 1323 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی نووسین
لە ویلایەتی موسڵ شیفرەی تەلەگرافنامە وەرگیراوە
شێخ سدیقی شەمدینانی لەگەڵ ئەوانەی بەم ناوچەیە هاتووچۆ دەکەن کەسانێك بە ناوی سیتۆ و تیتۆ، واتە ئەو چەتانەی هان داوە، تا لە وەرزی بەهاردا ناوچەکانی زێبار و شێروان ئابلۆقە بدات و هێرشیان دەکاتە سەر، ئەم هەواڵەش لە شوێنێکی باوەر پێکراوەوە هاتووە و بۆ ویلایەتی وانیش نووسراوەتەوە، لەبەر کەمی هێزی پۆلیس ئەگەر شتێکی ئاوا روو بدات ئەوا ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە، بۆ رێگەگرتن لە روودانی ئەو رووداوە، لە ویلایەتی ناوهاتوو فەرمانی کاریگەر دراوە، لەگەڵ رێزی مندا، فەرمان.
لە ٢٦ شوبات ١٣٢٠

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
340 | 121


DH.ŞFR.00340.00121.001

| 4 موحەررەم 1323 | 00340.00121 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>شێخ سدیقی شەمدینانی ئەوانەی لەوێ هاتووچۆ دەکەن بە نهێنی لەگەڵ چەتە بە ناوی سیتۆ و تیتۆ ڕێککەوتووە، لە یەکەم بەهاردا پەلاماری لایەنی زێبار و شێروان دەدەن، بە وێنەیەکی پەسەند کراو هەواڵ نێردراوە، ئەگەر لە ویلایەتی وانیش نووسرابێتەوە، بە گوێرەی کەمی پۆلیس لە ناوچەکە ئەگەر سنووربەزاندنێکی لەم شێوەیە روو بدات ئەنجامی ناخۆشی لێ دەکەوێتەوە، بۆ ڕێگری کردن لەمانە لە ویلایەتی ناوهاتوو تکا دەکرێت فەرمانی کاریگەر بدرێت، فەرمان.<br>لە ٢٦ شوبات ١٣٢٠ | | |


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

تلغراف نامه

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
358 72

DH.ŞFR.00358.00072.001

| DH.ŞFR. | 00358.00072 | 28 شەوال 1323 |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

لـە ١٠ کانوونـی یەکـەم ١٣٢١ لـە نێـوان هەرکـی و سـورچی و زێبـار لەبـارەی نەهێشـتنی ئـەو ناکۆکییـەی هەیـە، ئـاگاداری دراوەتـە قائیمقامیەتـی عەقـرە، بەیەکـەوە لـە بنکـە ئـەو مەفرەزەیـەی رەوانـەی قـەزا کـراوە، بـە باشـی بـەکار نەهاتـووە، هـۆکاری داوەتـە دەسـت کـە ئـەو ناکۆکیـە گەیشـتۆتە پلـەی شـەڕ و بەرەوپێش چـووە، قائیمقامی قـەزای ناوهاتـوو رەفعـەت ئەفەنـدی لـە رووی کارگێڕیـەوە بەڕێوەبردنەکـەی بـاش نییـە، بـە بڕیـاری ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت لـە بنکـەی ویلایـەت بـە وەکالـەت ئەندامـی پێشـووی دادگای دووبـارە پێداچوونـەوە (محکمـە استـناف) و لێهاتـوو سـاڵح سـوعادی ئەفەنـدی ڕێنمایـی تـەواوی دراوەتـێ و بـۆ قائیمقامیـەت نێـردراوە، لـە کۆتایـی ئـەو نووسراوانـەی لـە قـەزای ناوهاتـوو وەرگیـراوە، دەرکەوتـووە ئـەو کۆمەڵـەی کۆبوونەتـەوە پەرشـوبڵاو بۆنەتـەوە، ڕاگەیەنـدراوە فەرمـان.

مستەفا والی موسڵ

لە ١٣ کانوونی یەکەم ١٣٢١



| 11 موحەررەم 1323 | 00939.00009 | DH.MKT. |
|---|---|---|

بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
١١ موحەررەم ١٣٢٣
٥ مایس ١٣٢١
لە بارەی قائیمقامی قەزای زێبار، محەمەد عەلی بەگ لەگەڵ نائیبەکەی خولوسی ئەفەندی ئەو دادگاییەی کە کراوە لە ئەنجامی دادگاییەکەدا بەهۆی نەبوونی دڵنیایی تەواو، سکاڵانامە لەلایەن محەمەد عەلی بەگ و بریکاری داواکار و داواکراوی ئەنجوومەنی کارگێری گشتی ویلایەت لەبارەی پێداچوونەوە، بۆ ووردبینی کردن ڕێکخراوە، لەگەڵ کاغەزەکانی تر نێردراوە، ئەوەی لەم بارەیەوە لە ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢٩ کانوونی دووەم ١٣٢٠ بە ژمارە ١٢٧ نووسراو هاتووە، بە مەبەستی ووردبینی، بە هاوپێچەوە پێشکەشی جەنابی سەدارەتپەناهی کراوە تا بنێردرێتە شورای دەوڵەت.

صدارت عظمی مکتوبی قلمی



2 vrk
(1 shf boş)

| 29 ڕەبیعی کۆتایی 1312 | 000486.036377 | BEO. |
|---|---|---|

١٨ ئەیلوول ١٣١٠
بۆ ویلایەتی موسڵ
عەبدولرەحمان بەگ لە قائیمقامیەتی قەزای بازیان ٢٠ هەزار قوروش چۆتە سەر ناوی، لە قەزای زێباریش بە بریکار دامەزرا، بۆ ئەمە هەواڵ دراوە بە ئاماژەی جەنابتان.




| 1323 شەوال 26 | 002727.204508 | BEO. |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی

یەکەی چوارەم

وێنەی تەلەگرافنامەی بە شیفرەی قوماندانی لەشکری شەشەمی هومایۆنی بەغداد فەریقی یەکەم جەنابی سلێمان پاشا لە ٥ کانوونی یەکەم ١٣٢١ هاتووە

هاوپێچی تەلەگرافی ٢٩ تشرینی دووەمی ١٣٢١ ئەو تەلەگرافنامەیەی لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە، لە نێوان هۆزەکانی هەرکی و سورجی رووبەرووبوونەوە روویداوە، لە زێبارییەکان ٦ کەس کوژراوە، هەروەها بۆ رێگەگرتن لە روونەدانی رووبەرووبوونەوە ئەو ٤٥ کەسەی لە مەفرەزەی نیزامیە لە عەقرە بوونی هەیە لەگەڵ ٣٠ سوارەی ئێستر و ١١ ژاندارمەی ناوەخۆ بەس نییە، هەروەها ناردنیشی باش نییە، جگە لەمە لەبەر ئەوەی هێزی تر لەبەر دەست نییە، تا دەروات مەسەلەکە فراوان دەبێت، بۆیە داواکراوە لە کوێ گونجاوە لەوێ سەرباز بنێردرێت، بۆ جێبەجێکردنیشی بە گفتوگۆکردن لەگەڵ قوماندانیەتی فرقەی ١٢ هومایۆنی ویلایەت و بە وەڵامیش بۆ ویلایەت نووسراوە، هەروەك زانیاری سەروو ئەگەر بێتو ئەو هێزەی دەنێردرێت ئامادە نەبێت، ئەوا لە ویلایەت ئامادەکاری پێویست دەکرێت بۆ ئەوەی هۆکاری رووبەرووبوونەوەکە نەهێڵدرێت، راگەیەندراوە فەرمان.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.TSMK. 1324.11.15

OSMANLI ARŞİVİ
DH.TMIK.M
235 | 19 | 1

DH.TMIK.M.00235.00019.001

| 15 زیلقەعدە 1324 | 00235.00019 | DH.TMIK.M. |
|---|---|---|

بۆ پایەبەرزەکانی سەدارەت
بەهـۆی جۆرەهـا کاری چەتەیـی لەلایـەن دەوڵەتـەوە داواکـراوە، ئەمـرۆ چۆتـە لای شـێخی بـارزان لـە زێبـار، عەبدولعەزیـز عەبدوڵـڵا ئیسـماعیل تاهیـر لەگـەڵ هاوکارەکانـی لـە قـەزای عەمادیـە پێچەوانە هەڵسـوکەوت دەکەن و لـە ئەنجامـی رووبەرووبوونـەوە و تێکچوونیـان لـە چـوار مانـگ لەمەوپێـش قەزاکـە لـە ژێـر ئابڵوقـەدا بـووە، یـەك لـە دوای یـەك لـە ژێـر هێـرش کردنـدا بـووە، هەمـوو پارەوپـول و کەلوپەلمـان تـاڵان کـرا و هێرشـی کراوەتـە سـەر، لـە ئیشـوکار بێبـەش بوویـن و ژیانمـان لـە ژێـر هەڕەشـە دایـە، قەزاکەمـان بـە تەواوەتـی گەیشـتۆتە حاڵەتـی نەمـان، هـەر بۆیـە تـا ئێسـتا لەگـەڵ ئـەو هەمـوو سـەردانیەمان کەچـی هیـچ شـتێك نەکـراوە، بـە گشـتی تووشـی نائومێدی بوویـن و کۆچکردنمـان بۆتـە کارێکـی پێویسـت، تـکا دەکەیـن بـۆ ئـەو حاڵەتـە ئاسـایش بەرقـەرار بکـەن و کۆتایـی بـەم حاڵەتـە بهێنـن، یاخـود بـۆ کۆچکردنمـان شـوێنێك بدۆزنـەوە تـا تێیـدا نیشـتەجێ بیـن، دادپـەروەری بۆ پاشـایە و تـکا دەکەیـن، فەرمـان، لـە ٤ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٢.

مەحمود مودەرسی مەدرەسەی نوێ



ŞD.01050.00052.002

| ŞD. | 01050.00052 | 8 رەجەب 1324 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی سندوقی فەرمانبەرانی خانەنشین و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ٦٠٨٦
تەحسیلداری سوارە (سواری تحصیلداری) عەبدوڵڵا ئەفەندی مردووە، کوڕەکەی محەمەد شوکری ئەفەندی و خوشکەکەی خەیریە لەگەڵ خێزانەکەی سەلمە خان بۆ برینەوەی مووچە داواکاریان پێشکەش کردووە، نووسراو لە نەزارەتی دارایی ڕۆیشتووە، لەگەڵ داواکاری، خشتەی ماوەی ئەرك و کاغەزی پەیوەست بە ئەوەوە لە ژمێریاری ڕێکخراوە، بە پەراوێز هەژمارەکەی لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
لە نووسراوی باسکراو ناوبراوی مردوو مێژووی ئەرکەکانی و ئەو برە مووچەی وەریگرتووە لە مێژووی ١٥ مارت ١٣٢٢ مردنی، بە پشت بەستن بە بریارنامەی خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیە ئەوانە مانگانە ٩٠ قوروش مووچە وەردەگرن، بە گوێرەی بریارنامەی ناوهاتوو مامەڵەیان جێبەجێ دەکرێت، نووسراو لە سندوق کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٨ رەجەب ١٣٢٤ و لە ١٥ ئۆغستۆس ١٣٢٢.



| 19 رەجەب 1324 | 01115.00055 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١٩ رەجەب ١٣٢٤
٢٦ ئۆغستۆس ١٣٢٢
بۆ ویلایەتی موسڵ
قائیمقامی مۆڵگەی قەزای زێبار محەمەد عەلی بەگ و هاوەڵانی ئەو دادگاییەی لە شورای دەوڵەت بۆیان ئەنجام درا، ئەنجامی دادگاییەکە براوەتەو، هەروەها لە سەرۆکایەتی جەلیلە داوای هیممەت لە سەدارەتپەناهی کراوە، وێنەیەکی راگەیەندراوەکە بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە.



| 27 شەعبان 1324 | 01128.00027 | DH.MKT. |
|---|---|---|
| - ٢٧ شەعبان ١٣٢٤<br>٢ تشرینی یەکەم ١٣٢٢<br>بۆ نەزارەتی سندوقی فەرمانبەرانی خانەنشین<br>داوای کـردووە مووچـەی دوورخسـتنەوەی بـۆ ببرێتـەوە، قائیمقامـی پێشـووی زێبـار محەمـەد لەسـەر کاغـەزی وەرگێـری پەسـەند کـراوی، خشـتەی مـاوەی خزمەتـی ڕێکخـراوە لەگـەڵ ئـەوەش کاغـەزی جۆراوجـۆری پێشـکەش کـراوە، هیممـەت بکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنـی.<br><br>- بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>٥٧٦<br>داوای کـردوە مووچـەی دوورخسـتنەوەی بـۆ ببرێتـەوە قائیمقامـی پێشـووی زێبـار، محەمـەد لەسـەر کاغـەزی وەرگێـری پەسـەند کـراوی، خشـتەی مـاوەی خزمەتـی ڕێکخـراوە لەگەڵ ئـەوە کاغـەزی جۆراوجۆری پێشـکەش کراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی نـووسراو بـۆ نەزارەتـی سـندوقی فەرمانبەرانـی خانەنشـین کـراوە و جەنابـی نەزارەتپەناهیـش فەرموویەتـی، بۆیـە ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٦ شـەعبان ١٣٢٤ و لـە ٢١ ئەیلـوول ١٣٢٢. | | |

| 16 شەوال 1313 | 00942.00079 | ŞD. |
|---|---|---|

فەرمانگەی خانەنشینی مولکیە
ژمارە ٣٩٠٢
لەلایەن بریکاری قائیمقامی قەزای زێبار، محەمەد بەهجەت ئەفەندی داوای جێبەجێکردنی خانەنشینی کردووە، لە ویلایەتی مەعمورەتولعەزیزە داواکاری پێشکەش کراوە، لەگەڵ داواکاریەکەی خشتەی ماوەی خزمەتی لەسەر کاغەزی ژمێریاری ڕێکخراوە، بە پەراوێز لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
بە گوێرەی ئەو خزمەتانەی کە ناوبراو کردوویەتی لەگەڵ مێژووی بری ئەو مووچانەی کە وەریگرتووە و لە مێژووی ٤ مایس ١٣١٠ دەستی کێشاوەتەوە، هەروەها ماوەی خزمەتی ٣٢ ساڵ دەبێت، بە پشت بەستن بە بڕیاری فەرمانبەرانی مولکیە، ماددەکانی ٢٦ و ٤٢ دوای زیادکردن و کەم کردنەوە، ٧٧٨ قوروش مووچەکەی جێگیرکراوە، بە نیشان دانی ئەو برە مووچەیەی لە سندوق ڕێکخراوە، نووسراو بۆ خانەنشین کردنی جێبەجێ کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ١٦ شەوال ١٣١٣ و لە ١٩ مارت ١٣١٢




| BEO. | 002972.222900 | 18 زیلقەعدە 1324 |
|---|---|---|

٢١ کانوونی یەکەم ١٣٢٢
بۆ ویلایەتی موسڵ
هاوپێچ ٢٦ تشرینی یەکەم ١٣٢٢ لە سەرۆکەکانی هۆزی زێبار لەلایەن سلێمان و عومەر کوڕی کرکری، لە دانیشتووانی گوندەکانی ئیحساد و تەل کەبیر لە ئەیلوولی رابردوودا ئاژەڵیان تاڵان کردووە، بۆ گەرانەوەی ئەو ئاژەڵانە و بە پەلە دەستگیرکردن و تەمبێ کردنی ئەوانە، لە ویلایەت ئامادەکاری باش کراوە، ئەمجارە لە باڵیۆزخانەی ئینگلتەرا سکاڵا پێشکەش کراوە، بە تێروانین لە راگەیەندراوەکە و ئاگاداری پێشوو، بە پەلە بارودۆخەکە روون بکرێتەوە و هەواڵ بنێردرێت کە تا ئێستا چی کراوە.




İ.TKS.00019.00038.001

| I.TKS. | 00019.00038 | 1 ڕەجەب 1325 |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت

١٥٥٣

لـە مۆڵگـەی قـەزای زێبـار بـۆ ڕێکخسـتنی مووچـەی دەسـت لـە کارکێشـانەوەی قائیمقامـی پێشـوو محەمـەد عەلی بـەگ لـە دەسـتەی گشـتی فەرمانگـەی سـندوقی خانەنشـینی فەرمانبـەران لـە ٨ ڕەبیعـی کۆتایـی ١٣٢٥ ژمـارە ١٠٢٠ داواکاری نێـردراوە، لەگـەڵ خشـتەی فەرمانگـەی ڕێکخسـتن خوێندراوەتـەوە

خزمەتـی ٢١ سـاڵی ناوبـراو سـێ یەکـی مووچەکـەی کـە دەکاتـە ٣٧٥ قـوروش وەکـو مووچـەی دەسـت لـە کارکێشـانەوە بـۆی دەبردرێتـەوە، هەروەهـا بـە گوێـرەی بڕیارنامـەی بڕیارەکانـی مووچەی دەست لە کارکێشانەوەی فەرمانبەرانـی مولکیـە گونجـاوە، بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، مامەڵـەی جێبەجـێ کردنەکەشـی بـە نـووسراو زانیـاری دراوەتـە نەزارەتـی سـندوق و نەزارەتـی ناوەخـۆ، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.

لە ١ ڕەجەب ١٣٢٥ و لە ٢٨ تەمموز ١٣٢٣




| 8 ڕەبیعی کۆتایی 1325 | 01114.00063 | ŞD. |
|---|---|---|

نەزارەتی فەرمانبەرانی خانەنشین و دوورخراوان
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٠٢٠

لەلایەن قائیمقامی پێشووی مۆڵگەی قەزای زێبار محەمەد عەلی بەگ بۆ برینەوەی مووچەی دابراوان ئەو داواکاریەی دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە لەگەڵ خشتەی ماوەی خزمەتی کاغەزی وەرگێردراوی زانیاری کەسێتی لە ژمێریاری ڕێکخراوە، هەژماری لە پەراوێزی دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە.
لەسەر ئەو کاغەزە پەسەند کراوانە دەرکەوتووە و ئەو خشتەیەی کە هاوپێچە بە تێروتەسەلی نیشان دراوە، ناوبراو خزمەتەکانی پێشووی گەیشتۆتە ٢١ ساڵ، هەروەها لە ژێر دادگاییکردندا جەنابی خەلافەتپەناهی بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، لە کۆتاییدا لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ بێتاوانی سەلمێنراوە، لە کاغەزی زانیاری کەسێتی نووسراوەتەوە، بە ڕاگەیاندن لە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە مێژووی ١٤ نیسان ١٣٢٣ ژمارە ٤٠ بە وەڵامی نووسراو بێتاوانی ناوبراو پەسەند کراوە، هەروەها لە هیچ شتێك قەدەغە نەکراوە، ئەمجارە لە شورای دەوڵەت فەرمانگەی مولکیە نووسراو لە ٨ نیسان ١٣٢٣ نێردراوە، هەروەها ئەو بڕیارنامەیەی زیادکردن و کەمکردنەوەی تێدا نیشان داوە، مووچەی دابراوانی ناوبراو بە گوێرەی مامەڵەی دابین کردن لە بڕیارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری ١ مایس ١٣٢٣ بڕیاری جێبەجێ کردنی دراوە، بە ماددەی ٨ی بڕیارنامەی فەرمانبەرانی مولکیەی دابراوان سێ یەکی مووچەکەی ٣٧٥ قوروش بە پشت بەستن بە بڕیارنامەی ناوهاتوو لە ماددەی شەشەم مامەڵەکە جێبەجێ دەکرێت، لە مێژووی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی مووچەکەی لە مووچەی دابراوان بۆی دەبردرێتەوە و پێی دەدرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٨ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٥ و لە ٨ مایس ١٣٢٣.



| 5 رەبیعی یەکەم 1325 | 003038.227790 | BEO. |
|---|---|---|

لە ٥ رەبیعی یەکەم ١٣٢٥
لە ٥ نیسان ١٣٢٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
فەرمانگەی فەرمانبەرانی شورای دەوڵەت داواکاری نووسراو لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەران بەردەست کراوە، بۆ جێبەجێکردنی نێردراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە.

قائیمقامی پێشووی زێبار محەمەد عەلی بەگ مۆڵەتی وەرگرتن و راست کردنەوەی وەرگێردراوی کاغەزەکەیەتی.



| 13 ڕەجەب 1325 | 003130.234693 | BEO. |
|---|---|---|

لە ١٢ ڕەجەب ١٣٢٥
لە ٨ ئۆغستۆس ١٣٢٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
قائیمقامی پێشووی قەزای زێبار محەمەد عەلی بەگ بە پشت بەستن بە بڕیارێكی بڕیارنامەی تایبەتی مانگانە ٣٧٥ قوروش مووچەی دوورخستنەوەی بۆ دەبڕدرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە بە بڕیاری شورای دەوڵەت بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی خەلافەتپەناهی فەرموویەتی، نووسراویش كراوە تا جێبەجێ بكرێت.

بۆ نەزارەتی سندوقی فەرمانبەرانی خانەنشین و دوورخراوان
وێنەكانیان بە نووسراوەوە و بە فەرمانی جەنابی خەلافەتپەناهی فەرمان دراوەتەوە نەزارەتی سندوقی خانەنشین و دوورخراوان بۆ جێبەجێ كردنی.


داخلیه مکتوبی قلمی

| DH.MKT. | 01264.00003 | 26 جەمادی یەکەم 1326 |
|---|---|---|

٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٦
١٢ حوزەیران ١٣٢٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە زاناکانی قەسەبەی زێبار و لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لەگەڵ خانەوادەکەی لە شامی شەریفە نیشتەجێ بووە، هەروەها دووچاری هەژاری و تەنگانە بۆتەوە، ئەو تێگەیشتنەی لە لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە شێخ حوسێن ئەفەندی وەکو سەدەقەی جەنابی تاجدار مانگانە ٢٠٠ قوروش مووچەی بۆ بڕێتەوە، بۆ ئەمەش لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی سوریا داواکاری لە مێژووی ٢٧ نیسان ١٣٢٤ ژمارە ٤١ هاوپێچ پێشکەش کراوە.




DH.MKT.01300.00010.002

<table>
<tr><td>21 شەعبان 1326</td><td>01300.00010</td><td>DH.MKT.</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی فەرمانبەران<br>ژمارە ٤٦٢<br>قائیمقامی قەزای خەیرە بۆلۆ، نەجیب بەگ بەهۆی دەست لە کار کێشانەوەی، لە شوێن ئەو کەسێکی گونجاو دادەمەزرێت بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی ئەدرنە نووسراو لە مێژووی ١٢ ئۆغستۆس ١٣٢٤ ژمارە ٤٩٧ هاتووە و حەواڵە کراوە، لەم نووسراوەی کە نووسراوەتەوە ناوبراو لە قەزای ناوهاتوو لە چینی سێیەمە و لە تۆمارەکان دەرکەوتووە، بە ئاماژە پێکردنیەوە دەبێ بۆ قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو لە هەمان چین هەڵبژێردرێت، قائیمقامی پێشووی زێباریش محەمەد عەلی بەگ دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە داوای یارمەتی جەنابی نەزارەتپەناهی کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢١ شەعبان ١٣٢٦ و لە ٤ ئەیلوول ١٣٢٤.</td></tr>
</table>



| 11 زیلقەعدە 1326 | 02674.00062 | DH.MKT. |
|---|---|---|

١١ زیلقەعدە ١٣٢٦
٢٢ تشرینی دووەم ١٣٢٤
جەنابیسەدارەتپەناهی
شـوکری و بـرادەری لەگـەڵ چەتـەی نـاودار سـلێمان بارزانـی بوێـری ئـەوە دەکـەن ئاسـایش تێـك بـدەن و کەلوپـەل و پارەوپـول تـاڵان بکـەن، جگـە لـەوە تـاوان ئەنجـام دەدەن، بۆیـە گوندنشـینی سەرسـەخت شـوکری و بـرادەری لەگـەڵ چەتـەی نـاودار سـلێمان بارزانـی دەسـتگیر کـراون، لـەم کارە ئـەوەی خزمەتـی باشـی بینراوە بەڕێوەبـەری ناحیـەی خاڵیـاز، سـلێمان ئاغایـە، بۆیـە بـە یـەك پارچـە مەدالیـا ڕێـزی لێگـراوە، ئـەو نووسراوانـەی لـە ویلایەتـی ئـەرزروم وەرگیـراوە، پێشـکەش کـراوە، جێبەجـێ کردنیشـی لەسـەر هـاوکاری سـەدارەتپەناهی وەسـتاوە.



| 28 جەمادی یەکەم 1326 | 003345.250872 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٢٨ جەمادی یەکەم ١٣٢٦
١٤ حوزەیران ١٣٢٤
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
شێخ حوسێن ئەفەندی لە زاناکانی قەسەبەی زێبار و لە شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لە شامی شەریفە نیشتەجێیە، بۆ جەنابی پایەبەرز کەسێکی دڵسۆزە، بۆ برینەوەی مووچەی ٢٠٠ قوروشی مانگانە داواکاری لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی سوریە هاتووە و بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە نێردراوە، نووسراوی مێژووی ٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٦ ژمارە ١٤٥٣ بە هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردن هیممەت بکرێت.

| BEO. | 003412.255860 | 14 رەمەزان 1326 |
|---|---|---|

١٤ رەمەزان ١٣٢٦
٢٧ ئەیلوول ١٣٢٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ قائیمقامیەتی قەزای خەیرە بۆلۆ، قائیمقامی پێشووی زێبار محەمەد عەلی دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە بە پشت بەستن بە نووسراو لە مێژووی ٢٦ شەعبان ١٣٢٦ ژمارە ٢٥٤١ بە مۆڵەت دانی مێژووی ١١ رەمەزان ١٣٢٦ فەرمانی پاشای جەنابی پاشا دەرچووە.




DH.MUİ..00001.2.00029.005

| DH.MUI. | 00001.2.00029 | 22 شەعبان 1327 |
| --- | --- | --- |

هێنانی ئەو شیفرەیە کە لە قوماندانیەتی والی موسڵ و دەوروبەری وەرگیراوە

لـە ١١ ئۆغسـتۆس ١٣٢٥ فەرمانـی پێویسـت دەرچـووە بـۆ کۆکردنـەوە و هێنانـی هـاوکاری هـۆزەکان، لـە هەمـوو لایـەك دەسـت بـە جموجـۆڵ کـراوە، هەروەهـا بە گەیشـتنی هەژمـاری راسـتەقینە دەردەکەوێت، ناوچـەی چەتەکان و دەورووبـەری لـە بەرزایـی و چیـای سـەخت پێـك دێـت، بۆیـە ٤٠٠ سـوارە و ١٦٠٠ پیـادەی تفەنگچـی پێـك دێـن، کـە هـەر هەمـووی دەکاتـە ٢٠٠٠ ئەوانـە لـە هێنـان و کۆکردنەوەیـان هـەم هـاوکاری سـەربازی شـاهانە دەکـەن کـە لـە یاخیبـووەکان دەدەن و دووریاندەخەنـەوە، هـەم لەگـەڵ ئـەوان رێکدەکـەون هـەم بیرۆکەیان دەبێـت و رێگەیان لـێ دەگـرن، بـە تێروانیـن لـە بارودۆخـی ئێسـتا لـە مـاوەی ٢٠ رۆژ بـۆ ئـەم کارە ئەنجامێـك دەدرێـت بـە دەسـتەوە، هەروەهـا بـۆ ئـەم هاوکاریانەیـان رۆژانـە بـۆ هـەر سـوارەیەک ٣ قـوروش و پیادەکانیـش هـەر یەکـە ٦٠ پـارە رۆژانـە بۆیـان هەژمـار دەکرێـت، هـەر هەمـووی دەکاتـە ٧٢٠٠٠ قـوروش، بـۆ رێکخسـتن و خـەرج کردنـی داوای هـاوکاری کـراوە، هەروەهـا بـۆ بەنـدەکان ٢ تابـور پیـادە و ١ بلـۆك سـوارەی ئێسـتر لەگـەڵ ٤ پارچە تۆپـی چیا ئەمرۆ بـۆ عەقرە کـە دوو قۆنـاق ماوەکەیەتـی گەیشـتۆتە ناوچەیـەك بـە نـاوی گردمامـك، لـە ٢١ ئۆغسـتۆس ١٣٢٥.

لە گردمامك والی موسڵ و دەورووبەری قۆماندانی فەریقی یەکەم فازڵ



| DH.MUI. | 00001.3.00010 | 3 ڕەمەزان 1327 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری ناوەخۆ
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: بۆ تەمبێ کردنی چەتەکانی بارزان خەرجی ئەو تابورەی کە چەکدار کراوە

بۆ جەنابی نازر
لە مێژووی ٣٠ ئۆغستۆس ١٣٢٥ هاوپێچی نووسراوی بەندەتانە، لە لایەنی عەقرە بۆ تەمبێ کردنی چەتەکانی بارزان بۆ ناردنی ئەو هێزە، تابوری ڕەدیفی بەعشیقە چەکدار کراوە، بۆ مسۆگەر کردنی کارگێری بری خەرجی ئەوانەش لەسەر ئاماژەی نەزارەتی جەنگی لە سەر داهاتی لەشکری شەشەم ڕێك دەخرێت، بە تەلەگراف دەفتەرداری موسڵ ئاگادار کراوەتەوە، بەڕێزم بە پەلە دەست بەکارەکان دەکرێت، لە ٣ ڕەمەزان ١٣٢٧ و لە ٥ ئەیلوول ١٣٢٥.

بە ناوی نازری دارایی ڕاوێژکار

DH.MUİ..00001.3.00027.002

| DH.MUI. | 00001.3.00027 | 18 رەمەزان 1327 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لـە یاخـی بووەکانـی بـارزان لـە بەرامبـەر سـەربازی شـاهانە چەکـی بـەکار هێنـاوە، عەبدولسـەلام شـێخی بـارزان بە زیندوویی لەگـەڵ ٣٥ کـەس لـە دێوانەکانـی دەسـتگیر کـراوە کـە یاخـی بوونـی ڕاگەیانـدووە، جگـە لـەوە ١٧ کـەس لـە خانەوادەکـەی لەگـەڵ ١٣٧٥ سـەر مـەڕ لەگـەڵ ٨ سـەر ئێسـتر و ١٨٢ سـەر مانگا دەسـت بەسـەر کـراوە، مانگاکان بـۆ موسـڵ بـۆ بینباشـی ئیبراهیـم ئەفەنـدی نێـردراوە، لەوێـش شـێخی ناوبـراو و چەتـە هاوبەشـەکانی هەڵاتـوون و خۆیـان بـزر کـردووە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لێکۆڵینـەوە و پشـکنین ئەنجـام دەدرێـت، بـە پەنـا و میهرەبانـی خـوا بـەم زووانـە مەسـەلەی بـارزان بـە خێـر کۆتایـی دێـت، ڕاگەیەنـدراوە.

١٥ ئەیلوول ١٣٢٥

لە مزوری باڵاوە بۆ والی و قۆماندانی فەریقی یەکەم محەمەد فازڵ



DH.MUİ..00001.3.00060.002

| 29 ڕەمەزان 1327 | 00001.3.00060 | DH.MUI. |
|---|---|---|

٢٩ ڕەمەزان ١٣٢٧
١ تشرینی یەكەم
١٣٢٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی و نەزارەتی جەنگی پایەبەرز
٢٠ ئەیلـوول ١٣٢٥ هاوپێـچ مێـژووی نووسراوی بەندەمانە شـێخی بارزان لەگەڵ هاوبەشـەكەی فەقی عەبدولرەحمان و منداڵەكانـی هەروەهـا سـەرۆكی چەتـەكان قـادر و خالـد لـە نـاو ویلایەتـی وان لەلایـەن كریسـتانیەكانی تەیـاری ئـەو هۆزانـەی سـەر بـە ئەوانـن خۆیـان حەشـار داوە، هەروەهـا لـەوێ جموجۆڵـی سـەربازی سـەركەوتوو نابێـت و لـە بەرژەوەنـدی دەوڵـەت نابێـت، لـەو سـونگەوە لەگـەڵ ویلایەتـی نـاو هاتـوو خەریكی گفتوگـۆ كردنـن، هەروەها شـێخی ناوبـراو بـە دووبـارە گەرانـەوەی بـۆ ناوچەكـەی ئەگەرچـی هیـچ ئەگەرێكـی دروسـت بوونـی ئاژاوەگێری پێ نـەدراوە، بـەڵام لەبەرامبـەر هـەر ئەگەرێكـدا لـە بـارزان دوو تـۆپ لەگـەڵ یـەك تابـور جێگیـر بكرێـت، هەروەها لە شـێروان پێویسـتە یـەك مەفـرەزە لەگـەڵ بەرێوەبەرێكـی لێهاتـوو بدۆزرێتـەوە، جگە لـەوە بـە وەرگرتنـی ڕەزامەندی لـە هـۆزە هاوكارەكانـدا تـا چەنـد ڕۆژێ تـر بـۆ چەنـد ڕۆژێ تـر دەگەرێتـەوە مەركـەزی ویلایـەت، ئەمجارە وێنـەی ئـەو تەلەگرافنامەیـەی لـە والـی موسـڵ جەنابـی فـازڵ پاشـا وەرگیـراوە، هاوپێـچ بۆ لایەنـی سـەروو بـەرز كراوەتەوە هەروەهـا نەزارەتـی جەنگـی ڕوون كردنـەوەی داوەتـە ویلایەتـی وان و ئـاگادار كراوەتـەوە، بەپەلە هیممەت بكرێت بـۆ جێبەجـێ كردنی.

| 8 رەمەزان 1327 | 00001.4.00075 | DH.MUI. |
| --- | --- | --- |

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
فەرمانگەی هەواڵگری گشتی
هۆبەی دووەم
وێنەی شیفرەی ئەو تەلەگرافنامەیەیە کە لەلایەن قوماندانیەتی والی موسڵ و دەورووبەری وەرگیراوە
لەگەڵ چوونە ناو گوندی بارزان لە یەکەم تەلەگراف رامگەیاندووە، لە کاتی لێکۆڵینەوە، دەرکەوتووە یاخیبووەکان بەیەکەوە رێککەوتوون، رواندز لەگەڵ شێخەکانی ناحیەی شێروان لە گووندی بیە بەیەکەوە هەڵاتوون، لەگەڵ تابوری سێیەمی رەدیفی موسڵ دوو تۆپی چیای لەشکری شەشەمی هومایۆن لە موسڵەوە هاتوون، بە قوماندانیەتی بینباشی ئەمین ئەفەندی لە گوندی بارزان و ئەسپ سوار و پیادە لە ئاڵای سوارەی موسڵ سەرەتا چۆتە عەقرە، ئینجا چۆتە ناحیەی زێبار و لەگەڵ ئەو ٥٠ کەسەی کە لە رواندزەوە هاتوون بۆ پاراستنی ناوچەکە لە سەر زاب پەریونەتەوە و گوندی بەرکیان بەجێ هێشتووە، لەگەڵ سێ تابور و چوار تۆپی لەشکری چوارەم پەنا بە خوا راستەوخۆ بۆ گوندی بیە جولەیان کردووە، گوندی ناوبراو لەسەر چیایەکی بەرزە بۆیە چیایەکەی بەرامبەری کراوەتە شوێنی مانەوە، هەروەها شەش تۆپیش بەهۆی ئەوەی کاریگەریەکانی بیزاوە، لە نێوان دوو چیایەکە دانراون، ..... هەروەها لە دوو کاتژمێر زیاتر ماوە هەیە، بە شەو لەو نێوەندە بە گوندی ریلەیی تێپەریوین بۆ بەیانیش لە گوندی بیە تێپەرێن، دواوەمان گرتووە، بۆ گوندی کانی لینم جولە کراوە، لەگەڵ کۆمەڵەی عەبدوڵڵا پاشای رواندزی یەکیان گرتووە، پاشای ناوبراو لەگەڵ یاخیبووەکانی شێروان لە سێ ناوچە شەری کردووە، کە زانیویەتی سەرکەوتوو دەبن، دوو هێز بەیەکگرتنیان بۆ رۆژی دواتر شێخی ناوهاتوو بۆ چیاکانی مزوری کە شەری تێدا کراوە جولە دەکات، تا ئەو ناوچەیەی کە لە بارزان بینیومانە گوندەکانیان بەجێ دەهێڵن هەروەها گوندەکانیان سووتاندووە، بۆ سەر چیاکان رادەکەن، ئەوانەی بوونەتە لایەنگری شێخ بە کۆمەڵ خەڵکی گوند و دەورووبەرەکانی پەرێشان بوونە و یەك لە دوای یەك بۆ سەر چیاکان دەرۆن و بۆ شوێنێکی نادیار خۆیان دەشارنەوە، لە ئەنجام ئەو ناوچانە بۆ رۆیشتن شوێنی ئەستەمن و بە ناچاری پێویست دەکات بەم ناوچانە تێپەرین، لە ٤ ئەیلوول ١٣٢٥.
لە گوندی کالینج والی موسڵ و دەورووبەری قوماندانی فەریقی یەکەم فازڵ

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
فەرمانگەی هەواڵگری گشتی
هۆبەی دووەم
٢٦٠٤
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
راگەیەندراوی بەندەتانە
یاخیبووەکانی بارزان و ئەوانەی لەگەڵ رێککەوتوون بۆ چاودێریکردنیان و دوورخستنەوەیان کاری سەربازی ئەنجام دەدرێت، بۆ ئەمەش ئەوەی هاوکاری دەکات و دڵسۆزی نیشان داوە، عەبدوڵڵا پاشای رواندزی بە یارمەتی ئەو بە یەکگرتووی بە کۆمەڵ و رێککەوتن، چاودێری کردن بەردەوام دەبێت، ئەوان رێککەوتوون خۆیان گوندەکانی بارزان دەسوتێنن و بەجێی دەهێڵن، لەگەڵ خێزانەکانیان بۆ لووتکەی چیاکان رادەکەن، هەروەها ئەو شوێنانەی خۆیان تێدا حەشار داوە، لەلایەن والی موسڵ جەنابی فازڵ پاشا تەلەگرافنامە هاتووە وێنەیەکی بۆ سەروو بەرز کراوەتەوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٨ رەمەزان ١٣٢٧ و لە ١٠ ئەیلوول ١٣٢٥.
نازری ناوەخۆ



| 14 زيلحيجه 1327 | 00001.6.00030 | DH.MUI. |
|---|---|---|

- ١٤ کانوونی پەکەم ١٣٢٥
بۆ جەنابی فازڵ پاشا والی موسڵ
شیفره
لە ٩ کانوونی یەکەم ١٣٢٥ هێزی پێویست ئامادە بکرێت بۆ ئەوەی چالاکی بارزان و چەتەگەریەکانیان دووبارە دەست بە خیانەت نەکەنەوە و توانای ئەوەیان نەبێت، جگە لەوە هیممەت بکرێت بۆ دوورخستنەوەیان و تەمبێ کردنیان.

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
فەرمانگەی هەواڵگری گشتی
یەکەی سێیەم
ئەو شیفرەیەیە کە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
بە گوێرەی ئەو فەرمانە دواییەی کە لە نەزارەتی جەنگی هاتووە، ئاماژە لە ویلایەتی وان دەرچووە، لە لەشکری چوارەم ئەو هێزەی ئامادە کراوە و نێردراوە، بە هاوکاری خوا لە دوای جەژن جولە دەکەم بۆ بارزان، لە نەزارەتپەناهیش رەزامەندی دراوە، لە ٩ کانوونی یەکەم ١٣٢٥.
والی و قوماندان فازڵ



داخلیه نظارتی مخابرات عمومیه دائره‌سی

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MUİ
1-6 | 38 | 2

| DH.MUI. | 00001.6.00038 | 13 شەوال 1327 |
| --- | --- | --- |

١٣ شەوال ١٣٢٧
١٥ تشرینی یەکەم ١٣٢٥
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
١٥ ئەیلول ١٣٢٥ مێژووی نووسراوی هاوپێچە، بۆ تەمبێ کردنی چەتەکانی هەمەوەند و دوورخستنەوەیان لەگەڵ سەربازی شاهانە بەیەکەوە ئەو هۆزانەی کە بەکاردەهێنرێن، بۆ خەرجیەکانیان لە ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان تا بریارێك دەدەن لە داهاتی سەربازی دابین بکرێت، پشت بەستن بە راگەیەندراوی نەزارەتی جەنگی بە میهرەبانیەوە بە قوماندانیەتی لەشکری شەشەم راگەیەندراوە، بەم شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، هەروەها بۆ خەرجی یەك مانگی دوورخستنەوەی یاخی بووەکانی بارزان و ئەو هۆزانە کە هاوکاربوون بری ٧٧٨٥ قوروش راگەیەندراوە، بۆ وەرگرتنی مۆڵەتیش تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، ئەو هۆزانەی باسیان کراوە کە هاوکاری دەوڵەتیان کردووە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەوا لە بودجەی گشتی رێك دەخرێت، نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ٢٥ تەمموز ١٣٢٥ نووسراوەتەوە، لەبەر ئەوەی خەرجی ناوەخۆیە بۆیە هەر لەوێ رێك دەخرێت، ئەگەر چی لە نەزارەتی جەنگی نووسراو کراوە، ئەو نووسراوەی کە ئاماژەی پێکراوە، لەبەر ئەوەی خەرجی دیاری کراو لە بودجەی نەزارەت مۆڵەتی نییە، ئەوا لە داهاتی ناوەخۆ پارەکە دابین دەکرێت، بۆیە لەبەر ئەوەی لە بودجەی دەرەکی خەرج دەکرێت، لەم جۆرە خەرجیانە پێویستە بریارێك بدرێت یاخود دەبێ لە بودجەی نەزارەتی جەنگی خەرج بکرێت.

| 29 زیلحیجه1327 | 00001.6.00069 | DH.MUI. |
|---|---|---|

٢٩ زیلحیجه ١٣٢٧
٢٩ کانوونی یەکەم ١٣٢٥
بۆ نەزارەتی جەنگی پایەبەرز
محیەددین پاشا ئەو کەسەی ئەرکی چاودێریکردن و دوورخستنەوەی پێ سپێردراوە، دەرکەوتووە خراپەکاری ئەنجام داوە، لەم بارەیەوە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە، پێشکەشی سەروو کراوە، بۆ جێبەجێ کردن.


داخلیه نظارتی مخابرات عمومیه دائره‌سی

OSMANLI ARŞİVİ
DH.MUİ
11-1 34

| 3 رەمەزان 1327 | 00011.1.00034 | DH.MUI. |
|---|---|---|

٣ رەمەزان ١٣٢٧
٥ ئەیلوول ١٣٢٥
بۆ نەزارەتی جەنگی پایەبەرز
هۆزەکانی شـەمدینان و گـەوار لەگـەڵ بارزانیـەکان بەیـەك گەیشـتوون، بـۆ تەمبـێ کردنـی ئەوانـە ئـەو هێـزە سـەربازییەی داوا کراوە، هەرچـی زووە ڕەوان بکرێـت، هەروەهـا ئـەو هێـزە سـەربازیە کە لە ژێـر قوماندانیەتی دایە ڕەت بکرێتـەوە، بەڵکـو پێویسـتە کەسـێکی بـە توانـا و لێهاتـووی فرقـەی قوماندانیەتـی دابمەزرێـت، تەلەگرافنامـەی ویلایەتـی موسـڵ بـۆ لایەنـی سـەروو نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکە پێویسـتە بـە پەلە کارەکـە ئەنجام بدرێت، فەرمانـی هیممـەت کـردن دراوە.


داخلیه نظارتی
امنیت عمومیه مدیریتی
قلمی
عمومی
خصوصی
(شیفره)


DH.ŞFR.00041.00103.001

| 1332 ڕەجەب 3 | 00041.00103 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتەکانی وان و موسڵ/ شیفرە
لەسەر گرنگی بارودۆخی شێخی بارزان بە گوێرەی ئەو ڕەفتارانەی پێشوو، فەرمان لە بنکە دراوە، لە ڕومیە وەڵام هاتووە، ئەگەرچی ئەگەری ئەوە هەیە ناوبراو لە ڕێگەی بارزان بۆ مەمالیکی شاهانە گەڕاوەتەوە، بەڵام بەمە باوەڕ ناکرێت، هەروەها شێخ لە ڕومیە، لەلایەن کەسێك لە لایەنگرانی دەوڵەتی ڕوسیا خۆی پاراستووە و لە ماڵی ئەو کەسە خۆی حەشار داوە، ئەم زانیاریە ئەگەرێکی زۆر بەهێزە، ئاماژە بە باڵیۆزی تەهران بە میهرەبانیەوە نەزارەتی دەرەوە ئاگادار کراوەتەوە، هەروەها چۆنیەتیشی بۆ ویلایەتەکانی موسڵ و وان نووسراوەتەوە، لەم ڕوانگەوە لێکۆڵینەوەی پێویست لەسەر هاتن و نەهاتنی بکرێت، هەروەها ئەو زانیاریەی لە ویلایەت هەیە ڕابگەیەندرێت، لە ١٥ مایس ١٣٣٠.
عەلی خضر بە ناوی نازر



داخلیه نظارتی
امنیت عمومیه مدیریتی
قلمی
عمومی
خصوصی
موصل ولایتنه
(شیفره)

DH.ŞFR.00041.00107.001

| 3 رەجەب 1332 | 00041.00107 | **DH.ŞFR.** |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
ویلاەتی موسڵ/ شیفرە
ژمارە ٢٠٣
لە چاودێری کردنی بەندەکانی بارزان دوای دەستگیرکردنی ئەو کەسانە لەلایەن حکوومەتی خۆچێی کەم کراوەتەوە، هەروەها لە کاتی تاوان، ئەوانەی دەستگیرنەکراون راگەیەندراوە بە دادپەروەری ئەگەر کێشە و گرفت دروست نەکەن، ئەوا دەستگیر نەکرێن، لەم لایەنەوە دەرکەوتووە لە بارزان ئەوانەی چاودێری دەکرێن، کەسە زیانبەخشەکان نەماون، راگەیەندراوە مەفرەزەکانیش بێ کار ماونەتەوە و دەست بەتاڵن، چونکە کاری چاودێری کردن تەواو بووە، بە تێروانین لەم حاڵەتەش ئەرکەکانیان کۆتایی هاتووە، هەر بۆیە ووتراوە کە پێویستە ئەو مەفرەزانە بگەرێنەوە، هەروەها بە ئاماژەی قوماندانیەتی لەشکری دوانزەی قولی بە میهرەبانیەوە نووسراو بۆ نەزارەتی جەنگی کراوە، بۆ جێبەجێ کردن، لە ١٥ مایس ١٣٣٠.
عەلی خضر بە ناوی نازر


باب عالی
داخلیه نظارتی
امنیت عمومیه مدیریتی
قلمی
عمومی
خصوصی
موصل ولایتنه (شیفره)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
41 | 123

DH.ŞFR.00041.00123.001

| 6 ڕەجەب 1332 | 00041.00123 | **DH.ŞFR.** |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
ژمارە ٢١٥
هاوپێچی ١ مایس ١٣٣٠ لە بارەی چاودێری کردنی بارزان لە ویلایەت هێشتا ڕێنمایی یەکجاری نەدراوە، قوماندانی قولی چاودێر بەمە کاریگەرە، هەروەها لە کاتی ئەنجامی یەکجارەکی چاودێری کردنەکە هەموو کەسەکان و هاوکارەکان ........ هەروەها بۆ هەواڵ گواستنەوە لە شوێن مەفرەزەی سوارەی ئیستر ئاژەڵی گواستنەوە بەکار هاتوون، بە ڕاگەیەندراوی قوماندانیەتی لەشکری دوانزەی قولی بە سۆزەوە نەزارەتی جەنگی ئاگادار کراوەتەوە، بۆ جێبەجێ کردن، لە ١٨ مایس ١٣٣٠.
عەلی خضر بە ناوی نازر




داخلیه نظارتی
امنیت عمومیه مدیریتی
قلمی
عمومی
خصوصی

(شیفره)

موصل ولایتنه

۷ مایس ۳۳۰ بارزان شیخنك دردستی تأیید ایتمدیکی وکیفیتك وسائط مختلفه ایله تحقیق ایدلکده بولندیغی واون برنجی قول اردو قوماندانلغنه ایدلن تبلیغه هنوز جواب ویرلمدیکی حربیه نظارتندن بیلدیرلمشدر

۱۹ مایس ۳۳۰ ناظر نامنه
علی خضر



DH.ŞFR.00041.00135.001

| 7 رەجەب 1332 | 00041.00135 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
ژمارە ٢٢١
لە ٧ مایس ١٣٣٠ شێخی بارزان دەستگیر نەکراوە، هەروەها لەگەڵ چۆنیەتی و شێوازی جۆراجۆر لە لێکۆڵینەوەدایە، لە لەشکری یانزەی قولی ئاگاداری هاتووە، بەڵام هێشتا وەڵام نەهاتووە، ئەمەش بە نەزارەتی جەنگی ڕاگەیەندراوە.

عەلی خضر بە ناوی نازر
لە ١٩ مایس ١٣٣٠


داخليه نظارتي

امنيت عموميه مديريتي

قلمي

عمومي

خصوصي

موصل ولايتنه

(شيفره)

OSMANLI ARŞİVİ

DH.ŞFR

41 | 168

DH.ŞFR.00041.00168.001

| DH.ŞFR. | 00041.00168 | 10 رەجەب 1332 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
ژمارە ٢٣٠
نووسراوی زیادە ١٩ مایس ١٣٣٠ شێخی بارزان دەستگیر کراوە و بەهۆی ساختە و فێڵی ئەفسەرایەتی لە بارەی ناوبراوەوە یەك زانیاری نییە، بە ئاگاداری قۆماندانیەتی لەشکری یانزەی قولی، نەزارەتی جەنگی ئاگادار کراوەتەوە، لە ٢٢ مایس ١٣٣٠.

عەلی خضر بە ناوی نازر



| 13 رەجەب 1332 | 00041.00189 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
ژمارە ٢٣٦
کاری چەتایەتیان پەسەند کراوە، لە بارەی سەرۆکەکانی هەمەوەند لەگەڵ بارزانیەکان پێشەکی یاسای چاودێری کردنیان دواخراوە، بۆ دووبارە ئەنجام دانەوەی ئەنجوومەنی بریکارەکان راسپێردراوە هەروەها لەسەر چۆنیەتیەکەی نەزارەتی دادوەری ئاگادار کراوەتەوە، بە نووسراوی ڕەزامەندی سەدارەتی سەدری ئەعزەم ئاماژەی پێکراوە، بۆ جێبەجێ کردن، لە ٢٥ مایس ١٣٣٠.
عەلی خضر بە ناوی نازر




داخلیه نظارتی
امنیت عمومیه مدیریتی
قلمی
عمومی
خصوصی

موصل ولایتنه (شیفره)



DH.ŞFR.00042.00107.001

| 1332 رەجەب 28 | 00042.00107 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
لە ٢٨ مایس ١٣٣٠ لەسەر تەرخان نەکردنی دامەزراوەی نوێ، پێویست دەکات لە سمێل بۆ دهۆك و عەمادیە، لە عەقرەش بۆ بارزان هێڵی تەلەگراف درێژ بکرێتەوە، چونکە ئەو هێڵەی ئێستا زۆر پێویستە، هەروەها لە نێوان سمێل و دهۆك بۆ درێژکردنەوەی هێڵی تەلەفۆن، هەواڵەکان مسۆگەر دەکات، ئەم هەواڵە دراوەتە ویلایەت، وەڵامەکەشی دراوەتەوە نەزارەتی تەلەگراف، لە ٩ حوزەیران ١٣٣٠.
عەلی خضر بەناوی نازر


OSMANLI ARŞİVİ
DH.EUM. MEM
43 1 1

| DH.EUM.MEM. | 00043.00001 | 24 سەفەر 1332 |
|---|---|---|

نووسراو
١١ کانوونی دووەم ١٣٢٩
لە ویلایەتی موسڵ مەرکەزەکەی گوندی بارزانە، لە ساڵی داهاتوو قەزایەك لە چینی سێیەم بە ناوی زێبار دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی ناوهاتوو بۆ دامەزراندنی پۆلیس یەك یاریدەدەری ئەفسەر لەگەڵ حەوت پۆلیس وەکو فەرمانبەر داهات وەردەگرن هەروەها زیادەکەشی گونجاو بینراوە، بۆ جێبەجێ کردنی پێشکەشی بەڕێوەبەرایەتی ژمێریاری دەکرێت، لە ٩ کانوونی دووەم ١٣٢٩.

DH.ŞFR.00045.00026.001

| 26 شەوال 1332 | 00045.00026 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەرێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
ژمارە ٨٢
بەهـۆی ڕووداوەکانـی ئـەو دواییـەی عەبدولسـەلام شـێخی بـارزان، بـە پەلـە لـە دیوانـی جەنگـی پلـەی سـزاکەی ڕابگەیەندرێـت.

لە ٤ ئەیلوول ١٣٣٠
نازر



DH.ŞFR.00045.00195.001

<table>
<tr><td>1332 زیلحیجه 15</td><td>00045.00195</td><td>DH.ŞFR.</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی<br>بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە<br>ژمارە ٨٦<br>لە وان شێخی بارزان دەستبەسەرکراوە، لەم کاتەدا لەم توانایەدا نییە بنێردرێتە موسڵ، ئەمەش بە ویلایەتی وان ڕاگەیەندراوە، بە تێڕوانین لەوەی کە لەو توانایەدا نییە ئەو ڕەوان بکرێت، لەبەر ئەوەی ناوبراو لە دیوانی جەنگی ویلایەتی وان دادگایی دەکرێت، بۆ ئەنجامدانی دادگاییەکەی تا ئێستا چ جموجوڵ و چ ئیشوکارێکی ئەنجام داوە، زانیاری تەواو دراوە کە کاغەزی نووسراو و بەڵگەکانی لێکۆڵینەوەی بنێردرێت، لە ٢٢ ئەیلوول ١٣٣٠.<br>عەلی خضر بە ناوی نازر</td></tr>
</table>

| 21 جەمادی کۆتایی 1332 | 00048.00027 | DH.EUM.MEM. |
|---|---|---|

نووسراو
پوختە: ژاندارمە ئۆنباشی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد بەگ بۆ ڕێزگرتن.

٤ مایس ١٣٣٠
لەلایەن گشت قوماندانیەتی ژاندارمە بۆ لایەنی سەروو
بەهۆی ئەو خزمەتە و کارانەی بەرامبەر بە هەڕەشەی بارزانیەکان ئەنجامی داوە، شایەدی لەسەرە، بۆ ڕێز لێنانی لە مێژووی ١٣ نیسان ١٣٣٠ نووسراو ژمارە ٤٥ پێشکەش کراوە، ژاندارمەی بلۆك ئۆنباشی ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد پێویست دەکات مامەڵەکەی لەوێ ئەنجام بدرێت و جێبەجێ بکرێت، چونکە مامەڵەی فەرمانبەری پۆلیسی لێرە جێبەجێ دەکرێت.



| DH.EUM.EMN. | 00071.00024 | 12 جەمادی کۆتایی 1332 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
تایبەتی ٧١
نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت
هاوپێچی شیفرەی تەلەگرافنامەی مێژووی ٢٥ نیسان ١٣٣٠یە، کاغەزەکانی شێخی بارزان ئەوانەی پەیوەندی بە دەرسەعادەتەوە هەیە لە ناو زەرفێك دانراوە، هەر بەشێك لە کاغەزەکان بە شوێنی خۆی لکاوە، پێشکەشی نوێنەری موسڵ ئیبراهیم فەوزی بەگ کراوە، لە گەیشتنی فەرمان و ئاماژەی پێ بکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە خاوەنی فەرمانە، لە جەمادی کۆتایی ١٣٣٢ و لە ٢٥ نیسان ١٣٣٠.
والی موسڵ

ووتوویەتی ئەو کاغەزانە پێشکەشی جەنابی یەکێك لە نوێنەران و نازر پاشا ئەفەندی دەکرێت.




| DH.EUM.2.ŞB. | 00073.00002 | 9 شەوال 1332 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>ئەو شیفرەیەی کە لە ویلایەتی وان وەرگیراوە<br>رووسەکان شێخی بارزانیان بۆ نیشتیمانی خۆیان ناردووە، مەبەستیان ئەوەیە بە پاڵپشتی لایەنگرەکانی و هۆزەکانی کارێك بکات، شاری خوی ئاگادار کراوەتەوە، لە ١٨ ئۆغستۆس ١٣٣٠.<br>والی تەحسین | | |



| 27 سەفەر 1332 | 00074.00078 | DH.EUM.MH. |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
هۆبەی فەرمانبەران
ژمارە ٨٤٢
لـە نـاو ویلایەتـی موسڵ گونـدی بـارزان دەکرێـت بـە مەرکـەز و بـە نـاوی زێباریـش لـە چینـی سـێیەم لـە سـاڵی داهاتـووەوە وەکـو قەزایـەك بونیـاد دەنێردرێـت، لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو بـۆ دامەزراندنـی پۆلیـس یەك یاریـدەدەری ئەفسـەر لەگـەڵ حـەوت فەرمانبـەری پۆلیـس خەرجیەکەیان دیـاری کـراوە و عەلاوەکەی گونجـاوە، بۆ جێبەجێکردنی ئـەم کارەش لـە نـووسراوی بەڕێوەبەرایەتـی ژمێریـاری پێشـکەش دەکرێت.
لە ١١ کانوونی دووەم ١٣٢٩




| 1332 ڕەجەب 2 | 00075.00014 | DH.EUM.EMN. |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگ
ئیستەنبۆڵ
هۆبەی سێیەم
٦٥٦
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختەی بارودۆخ: لە بارەی تەواو کردن و ئامادەبوونی بلۆکەکانی سنوور
بۆ جەنابی دەوڵەتی بەرێز
لە ٢١ نیسان ١٣٣٠ ژمارە ١٦٢ وەڵامی نووسراوی نەزارەتپەناهیە، ئەو بلۆکانەی سنوور کە لەوێن، بۆ چاودێری کردنی بارزانیەکان، هەواڵ بدرێتە ١٢٠یش، ئەمەش لە تەلەگرافنامەی قوماندانیەتی لەشکری دوانزەی قولی بە ئاشکرا ئاماژەی پێ کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
لە ٢٩ جەمادی کۆتایی ١٣٣٢ و لە ١٢ مایس ١٣٣٠

نازری جەنگی و سەرۆکی ئەرکانی گشتی جەنگی
یاریدەدەری راوێژکاری




باب عالی
دائرهٔ صدارت
دیوان همایون
٤٢٣
٩٩

قانون صورتیدر

ماده ١ – موصل ولایتی داخلنده زیبار ناحیه‌سی قضایه تحویل و بارزان قریه‌سی مرکز اتخاذ اولنمشدر

ماده ٢ – اشبو مادهٔ قانونیه تاریخ نشرندن معتبردر

ماده ٣ – اشبو قانونک اجرای احکامنه داخلیه ناظری مأموردر

اشبو لایحهٔ قانونیه‌نک مجلس عمومینک اجتماعنده قانونیتی تکلیف ایدلمک اوزره موقتاً موقع اجرایه وضعنی و قوانین دولته علاوه‌سنی اراده ایلدم ٢٥ جمادی الاولی ١٣٣٢ ٨ نیسان ١٣٣٠ محمد رشاد

صدراعظم
محمد سعید

داخلیه ناظری
طلعت

اصلنه مطابقدر
بکلکی دیوان همایون



| 25 جەمادی یەکەم 1332 | 00087.00057 | DH.I.UM.EK. |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆن
٤٢٣
٩٩
وێنەی یاسایی
مادده ١// له ناو ویلایەتی موسڵ ناحیەی زێبار بۆتە قەزا و گوندی بارزانیش وەکو مەرکەز دانراوە.
مادده ٢// لەم کارەدا مادده یاساییەکە لە مێژووی بڵاوکردنەوەیدا هەژمار دەکرێت.
مادده ٣// لە جێبەجێ کردنی ماددەی یاسایی نازری ناوەخۆ ئەم ئەرکەی پێ سپێردراوە.
لەم کارەدا لیستی یاساییەکە لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی لە رووی یاساییەوە داواکراوە، بە شێوەیەکی کاتی داوا دەکەم جێبەجێ بکرێت، لە ٢٥ جەمادی یەکەم ١٣٣٢ و ٨ نیسان ١٣٣٠.

محەمەد رەشاد
تەڵعەت نازری ناوەخۆ
محەمەد سەعید سەدری ئەعزەم


داخلیه نظارتی امنیت عمومیه مدیریتی

| DH.EUM.EMN. | 00114.00064 | 1 رەجەب 1332 |
|---|---|---|

١٣ مایس ١٣٣٠
بۆ ویلایەتی موسڵ
پۆختە: پەیوەستە بە نیشتەجێ کردنی ژاندارمە قولی لە بارزان

لـە ٣٠ نیسـان ١٣٣٠ وا نیشـان دراوە کـە ژاندارمـەی قولـی لـە بـارزان نیشـتەجێ بکرێـن، دوای لێکۆڵینـەوە و ڕێکخسـتنی نـووسراو بـۆ قوماندانیەتـی گشـتی ژاندارمـە بـە وەکالـەت نـووسراوە، ئەمجـارە لـە وەڵامـدا نـووسراو وەرگیـراوە، داهاتـی سـنوورەکان لـە بودجـە بـە جیـا دەنووسرێتـەوە، بـۆ تـەواو کـردن و ڕێکخسـتنی بلۆکـەکان پێویسـتە، هەروەهـا ئـاڵای ژاندارمـەی ویلایـەت ١٣٦ پیـادە و ٨٧ سـوارە بـە بەتاڵـی ماونەتـەوە، بـە تـەواو نەبوونیـان زیادکردنیـان گونجـاو نییـە، لـە کۆتاییـدا ڕێکخسـتنی کارگێـری سـوارەی ئێسـتر ئـەو هێـزەی لـە ویلایـەت هەیـە زیاد ناکرێـت، ئـەو هێـزەی کـە داواکـراوە لـە بوونـی ئاڵایەکـە ڕێکخسـتنەوەی پێویسـتە، لەگـەڵ گفتوگۆکـردن لەگـەڵ سەرپەرشـتیاری ناوچەکـە ئەوانـی تریـش تـەواو بکرێـن.



| DH.EUM.EMN. | 00116.00009 | 13 شەعبان 1332 |
|---|---|---|

ویلایەتی وان
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
پوختە: مەفرەزەی سەربازی لەگەڵ کوردەکانی ئێران لە نێوانیان ناکۆکی سەری هەڵداوە
بۆ جەنابی دەوڵەت

لە قەزای شەمدینان مەفرەزەی کیلیشەم یەك هەفتە پێشتر داوایان کردوو بوو سنوور ببرن، لەگەڵ دێوانەکانی بارزان تووشی رووبەرووبوونەوە بوونە، گشتی ناچاربوونە بگەڕێنەوە و هەڵێن، ئاماژە بە قوماندانیەتی بلۆکی ٢٠ی سەر سنوور بە میهرەبانیەوە ئاگاداری موتەسەرفی هەکاری کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ١٣ شەعبان ١٣٣٢ و لە ٢٤ حوزەیران ١٣٣٠
والی وان


DH.SYS.00117.00001.001


DH.SYS.00117.00001.001

| DH.SYS. | 00117.00001 | 10 موحەررەم 1332 |
|---|---|---|

شێخی بارزان عەبدولسەلام لەگەڵ بارزانیەکان لە دەورووبەری عەقرە و زێبار تاڵان و تاوانیان ئەنجام داوە، بەڵام لە کاتی ریزکردن هیچ بەڵگەیەك نەبینراوە، کەچی بە گوێرەی ژمارەی کاغەزەکان دەردەکەوێت شتێکی ئاوا بوونی هەیە.
قەڵەمی کاغەزی ناوەخۆ

| | | |
|---|---|---|
| ٨٣٤٥ | ٨١٩٨٤ | ٧٨٦٠٩ |
| ٨٣٠٩١ | ٨١٨٤١ | ٧٨٦٠٧ |
| ٨٣٤٢٢ | ٨١٧٦٦ | ٧٨٣٢٢ |
| ٨٤٠٨٢ | ٨١١١٦ | ٧٨١٢٦ |
| ٨٣١٠٥ | ٨٠٤٣٤ | ٧٨١٠٠ |
| ٨٣١٤٠ | ٨٠١١١ | ٧٧٩٧٣ |
| ٨٢٢٧ | ٨٠٠٨٨ | ٧٧٤٩٨ |
| ٨٢٢٦١ | ٨٠٠٠٠ | |
| ٨٢١٢١ | ٧٩٩٢٠ | |






DH.İD.00176.00069.002

| DH.ID. | 00176.00069 | 26 رەمەزان 1332 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
شیفرەی قەڵەم
ژمارە ١٦٧
ئەو شیفرەیەی لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
لـە هەمـوو ناوچەیەکـی ئێران بـە دوای شـێخی بارزانـدا دەگەڕێـن، نەزانـراوە لـە کوێیـە، بـەم دواییـە پروپاگەنـدەی مردنـی بـڵاو بۆتـەوە، بـەڵام تـا ئێسـتا پشتراسـت نەکراوەتـەوە، هەرچـی ڕێکخسـتنی کارگێـری قـەزای بـارزان لەلایـەن قائیمقامیـەت ماوەتـەوە، بـۆ ئـەوێ نـە مەفـرەزەی ژاندارمـە ڕۆیشـتووە نـە توانویەتـی لـە قـەزا فەرمانبـەر دامەزرێنێـت، نـە هێڵـی تەلەگـراف نـوێ بۆتـەوە، لەبـارەی دروسـت کردنـی پردەکـەی بۆ کۆتایـی هێنان بە دروسـت کردنـی هێشـتا چەنـد مانگێکـی دەوێـت، شـێخی بـارزان لـە ژیـان بێـت یاخـود مـرد بێـت، کـە قەزاکـە لـە نـاو ئـەو بارودۆخەدایـە هەڵگرتنـی تابـوری نیزامیـە دروسـت نییـە، تێروانیـن و وریایـی نەزارەتـی جەنگـی تێدا نیشـان دراوە و بـۆ هێنانیـان داواکـراوە، لـە ٢٦ تەممـوز ١٣٣٠.
والی نەزیف

| 10 موحەررەم 1332 | 00183.00023 | MV. |
|---|---|---|

١٠ موحەررەم ١٣٣٢
٢٧ تشرینی دووەم ١٣٢٩
پوختەی دارایی
خەریکە مەرکەزەکەی دەبێتە بارزان، بە ناوی زێبار لە چینی سێیەم قەزایەك رێك دەخرێت، لە بارەی لێکۆڵینەوەکان نووسراوی نەزارەتی ناوخۆ وەرگیراوە، لە وەڵامی راگەیەندراوەکەدا بۆ رێکخستنی نوێ، ئەوا بۆ زیادکردنی بوودجە چاکسازی دارایی لە قۆمیسیۆن رەزامەندی نەدراوە، هەروەها بۆ کۆتایی ساڵ ماوەیەکی کەم ماوە، لەم بارەیەوە لە بوودجەی ساڵی ١٣٣٠ پێشنیاری زیادەی ساڵانە دەکرێت، بۆ ئەم رێکخستنەش لە ماوەی ئەم ساڵە جێبەجێ کردنی پێویستی بە چاوپێخشاندنەوە دەکات، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی نەزارەتی دارایی هاوپێچ خوێندرایەوە.

بریار
راگەیەندراوی وێنەکە گونجاوە، بە گوێرەی ئاگاداری نەزارەتەکانی دارایی و ناوەخۆ لە بوودجەی ساڵی داهاتوو ئەوەی پێویستە دابین بکرێت لە بارەی زیادەی ساڵانە بە ئاماژەی فەرمانگەکانەوە نووسراوی زیادەی ساڵانە لە نەزارەتی دارایی نوسراوەتەوە.



| MV. | 00189.00017 | 9 رەجەب 1332 |
|---|---|---|

٩ رەجەب ١٣٣٢
٢١ مایس ١٣٣٠
پوختەی دارایی
لە نەزارەتی دادوەری نووسراوی مێژووی ٢٨ جەمادی کۆتایی ١٣٣٢، ١١ مایس ١٣٣٠ ژمارە ١٢١ خوێندرایەوە.

بریار
لە نووسراوی ناوهاتوو سەرۆکەکانی هەمەوەند لەگەڵ بارزانیەکان داوای پارێزگاریان کردووە، ئەمەش بە گوێرەی ئەو رەفتار و مامەڵەیەی کە نیشانی دەدەن روون دەبێتەوە، کە چاودێری ناکرێن و بێزار ناکرێن، لەگەڵ ئەوەش بە گوێرەی بریار بارودۆخ و جموجوڵیان لەلایەن حکوومەتی خۆچێیەوە هەمیشە لە ژێر چاودێری و چاوەکانەوە دەبێت، ئەو زانیاریانەی پێشووتر هاتووە، شێخی بارزان عەبدولسەلام جموجوڵی چەتەکانی ئەگەر دووبارە بێتەوە و بەردەوام بێت کاری سەربازی ئەنجام دەدرێت، لەبەر ئەوەی بارزانیەکان بۆ لای ئێران رایان کردووە، پێویست بە دواخستنی چاودێری کردنیان ناکات هەروەها هەمەوەندەکان هەر لە کۆنەوە بە چەتەیی دیارن و هەر کە دەست دەکرێت بە تەمبێ کردنیان ئەوا لەم ناوچەیە تاقمێك گەندەڵکار دەست دەکەن بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامە هەوڵ دەدەن شۆرش پەیدا بکەن، چ لە بارەی بارزانیەکان چ هەمەوەندەکان جێبەجێ کردنی یاسای چاودێرکردنیان لە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە، لە بارەی هۆزەکانی ناوهاتوو پێشەکی دواخستنی یاسای چاودێریکردنیان دووبارە دەست پێ بکرێتەوە و گونجاوە چاودێری بکرێن، بەم شێوەیە مامەڵەی جێبەجێ کردنەکە لە نەزارەتەکانی ناوخۆ و دادوەری نووسراو نێردراوە.


MV. 234/152
MV.00234

| 23 جەمادی یەکەم 1332 | 00234.00152 | MV. |
|---|---|---|

٢٣ جەمادی یەکەم ١٣٣٢
٦ نیسان ١٣٣٠
٤٢٣
داواکاری
نووسراو لە نەزارەتی ناوەخۆ خوێندنەوەی بۆ کراوە، بنکەکەی گوندی بارزانە ناحیەی زێبار هەوڵ دەدرێت بکرێتە قەزا، ئەمنیەت و ئاسایش و هەروەها تێچووی میری و داهاتەکەی مسۆگەر بکرێت هەروەها ئاسانکاری بکرێت. جگە لەوە بۆ دامەزراندنی قەزایەك كە لە چینی سێیەم دابێت دابینکردنەکانی لە بودجەی ١٣٣٠ ئەو داهاتەی بۆی ڕێك دەخرێت دەرکەوتووە گونجاوە، لەم بارەیەوە ئەو لیستە یاساییەی کە لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی یاسایەکە ڕێك دەخرێت و دەنێردرێت، لە ئێستاوە لیستی ناوهاتوو لەگەڵ بارودۆخی دانیشتووان بە باس کردن ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە.

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR 423/77

DH.ŞFR.00423.00077.001

| DH.ŞFR. | 00423.00077 | 16 رەجەب 1332 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

هاوپێچ ٢٥ و ٢٦ مایس ١٣٣٠ لە شەهبەندەری رومیە ئەمجارەش بە مێژووی ٦ نیسان تەلەگرافی بە شیفرە وەرگیراوە، لە ٢٧ مارت ١٣٣٠ راگەیەندراوە.

والی تەحسین

وێنە

هاوپێچی ژمارەی تەلەگرافە لە رومیە پیاوەکانی بارزان برێك تفەنگ و فیشەکیان کڕیوە، بە دڵنیاییەوە لە رێگەی کەلەشین و ماسیرو بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە.

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR. 424/62

DH.ŞFR.00424.00062.001

| 25 جەمادی یەکەم 1332 | 00424.00062 | **DH.ŞFR.** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

شێخی بارزان لەگەڵ ٥٠٠ لە پیاوەکانی لە شنۆ ناوەستن، دوێنێ بە نامە تکایان کردووە یا ئەوەتا لە گوندی راژان یاخود لە رومیە نیشتەجێ بکرێن، ئەمەش لە لایەن شەهبەندەری رومیە راگەیەندراوە، بۆ وەرگرتنی زانیاری راگەیەندراوە، لە ٨ نیسان ١٣٣٠.

تەحسین والی وان

DH.ŞFR.00425.00029.001

| 1 جەمادی کۆتایی 1332 | 00425.00029 | DH.ŞFR. |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لـە ٣ نیسـان ١٣٣٠ بـۆ چاودێـری کردنـی شـێخی بـارزان هـۆزەکان لەسـەر سـنووری ئێـران سـنوریان بەزانـدووە، بێگومـان ڕێگەیـان پـێ نـەدراوە، بـەڵام شـێخ ...... بـووە، لـە جموجۆڵـی ئـەم دواییـەدا خزمـەت و بوێـری بیـنراوە، لـە سـەرۆکەکانی هەرکـی حاجـی ئاغـا لەگـەڵ ٥ تـا ١٠ پیـاو بەیەکـەوە بـۆ ئێـران تێپەریـون، شـێخی بـەد ئـازادە و بوونـی هەیـە، ئێسـتاش لەگـەڵ ئامـادەکاری هەواڵگـری سـەرەتایی سـەرقاڵە، لـە ١٤ نیسـان ١٣٣٠.

والی سلێمان نەزیف

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت عليهٔ عثمانيه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH. ŞFR 425/109

DH.ŞFR.00425.00109.001

| DH.ŞFR. | 00425.00109 | 8 جەمادی کۆتایی 1332 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

ئـەو کاغەزانـەی لەسـەر شـێخی بـارزان دەسـت کەوتـوون، بـۆ وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی دوورخسـتنەوە، لـە ٧ نیسـانی ١٣٣٠ وەڵامـی شـیفرەی تەلەگرافنامـە دراوە، لـە ٢١ نیسـان ١٣٣٠.

والی نەزیف

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR 426/16

DH.ŞFR.00426.00016.001

| 11 جەمادی کۆتایی 1332 | 00426.00016 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

٢٤ نیسان ١٣٣٠

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

عەبدولسەلام شێخی بارزان لەگەڵ سێ میری تر لە دەوروبەری عەمادیە بە چاوساغی ....... گوندنشین بە ناوی کەرەم چۆتە ژێر پاراستنی رەشید بەگ، لە خانەی میر خۆی شاردۆتەوە، لەسەر هاتنی هەواڵ قوماندانی بلۆکی چاڵ لەگەڵ مەفرەزە بۆ دەستگیرکردنی چوونەتە چاودێری کردنی، بە قائیمقامیەتی چۆلەمێرگ راگەیەندراوە، لە ٢٤ نیسان ١٣٣٠.

والی تەحسین

T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

DH.ŞFR.00426.00061.001

T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

DH.ŞFR.00426.00061.001

| 15 جەمادی کۆتایی 1332 | 00426.00061 | **DH.ŞFR.** |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆ

لە ٩ نیسان ١٣٣٠ شێخی بارزان عەبدولسەلام هەڵاتووە، لە بارەی رادەست کردنەوەی بە باڵیۆزخانەی تەهران راگەیەندراوە، بەڵام لەبارەی رادەست کردنەوەی توندرەوی ناوبراو وەزارەتی دەرەوەی ئێران رازی نەبووە رادەستی مەمالیکی عوسمانیەی بکات، بۆیە بۆ رادەست کردنەوەی فەرمان لە سەر فەرمان بۆ ئازەربیجان نێردراوە، دەرکەوتووە لەسەر ئەو فەرمان و ئاگادارکردنەوانە، لەلایەن فەرمانبەرانی ئێرانەوە زانیاری وەرگیراوە چی بکرێت، بۆ ئەوەی شێخی چەتە لە خاکی خۆی دوور بخاتەوە هۆکارەکانی لە ویلایەتەوە نێردراوە، لەسەر ئاماژەی سەروو ئەگەر رادەست کردنەوەی شێخی ناوبراو دوابکەوێت، ئامادەکاری پێویست دەکرێت، فەرمان و نووسراو کراوە.

والی موسڵ نەزیف

DH.ŞFR.00427.00007.001

| DH.ŞFR. | 00427.00007 | 21 جەمادی کۆتایی 1332 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

هاوپێچ ٩ نیسان ١٣٣٠، چاودێریکردنی بارزان هیچ پێویستیەکی نەماوە و پێویست ناکات، قوماندانیەتی لەشکری قولی موسڵ و لە لەشکری یانزەی قولی، دوو تابور هێنراوەتە قەزای شەمدینان، ئەمەش لەسەر میهرەبانی پاشا بە ویلایەتی وان راگەیەندراوە، ئەو دوو تابورەی باسکراوە، لەوێوە تووشی کێشە بوونەتەوە، بۆ هەڵگرتنیان هیچ کێشەیەك نییە، لە ٤ مایس ١٣٣٠.

نەزیف والی موسڵ

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف ادارەسی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR.00427.00042.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00427.00042</td><td>24 جەمادی کۆتایی 1332</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>شێخی بارزانی خراپەکار لە خاکی ئێرانە، بۆ لەناوبردنی، لەسەر سنوور پارێزراویەك دروست بکرێت و لەگەڵ هێنانی شێخ ئەنجامی باش دەدرێت بە دەستەوە، ئومێدەوارم سەرکەوتوو بین.<br>والی نەزیف</td></tr>
</table>

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR 429/53

DH.ŞFR.00429.00053.001

| 13 ڕەجەب 1332 | 00429.00053 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لە ١٥ مایس ١٣٣٠ شێخی بارزان نەگەڕاوەتەوە ناو خاکی عوسمانی و ئەمرۆش بە دڵنیاییەوە لە ئێرانە، لەسەر ئەو ڕاگەیەندراوە، ناوبراو کە لە ئێرانە، بۆ لەناوبردنی شێخ سالح ئەفەندی بەڵێنی داوە، ئەمرۆ لەگەڵ پیاوەکانی بەیەکەوە بۆ چاودێری کردن سوراوەتەوە، ئەگەر چەتەی ناوهاتوو بگەڕێتەوە خاکی عوسمانی لەناوبردنی یەکلاییکەرەوەیە.

والی نەزیف

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف ادارەسی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

DH. ŞFR 430/78

DH.ŞFR.00430.00078.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00430.00078</td><td>23 رەجەب 1332</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>شێخی بارزان چەتە عەبدولسەلام هەڵاتووە و رووی کردۆتە چیای شیرین، ئەم پروپاگەندەیە هاتووە، هەر بۆیە بە قوماندانیەتی مەفرەزە ووتراوە، هەندێك ئامادەکاری یەدەگ کراوە، لە وەکالەتی قوماندانیەتی لەشکری قول بە نووسراو ئاماژەی پێکراوە، بۆ رێگری کردن لە ئەگەری جموجۆڵێکی ئاوا بەیەکەوە لەگەڵ قائیمقامیەتی عەقرە ئاماژە بە چۆنیەتی کراوە، ئەم پروپاگەندەیە بە هیچ شێوەیەك دروست نیە، قوماندانی مەفرەزە لەگەڵ بەرێوەبەری ناحیەی زێبار بەیەکەوە لێکۆڵینەوەیان کردووە و ئەو ئەنجامەی لێ دەرکەوتووە، ئەمەش لە قائیمقامیەت بە وەڵام هاتووە، هەروەها چۆنیەتیشی بە وەکالەتی قوماندانیەت ئاماژەی پێکراوە.<br>٤ حوزەیران ١٣٣٠<br>والی سلێمان نەزیف</td></tr>
</table>

DH.ŞFR.00438.00114.001

DH.ŞFR.00438.00114.001

| DH.ŞFR. | 00438.00114 | 6 شه‌وال 1332 |
|---|---|---|

بۆ نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆی جه‌لیله

هاوپێچ ته‌مموزی ١٣٣٠ له‌لایه‌ن دیوانه‌كانی شێخی بارزان له‌ سنووری زێبار له‌ كاتی جێبه‌جێ كردنی ئه‌ركدا یه‌ك ته‌حسیلدار (تحصیلدار) و چوار ژاندارمه‌ شه‌هید بووینه‌، به‌ وه‌رگرتنی ئه‌م هه‌واڵه‌ به‌ قائیمقامیه‌تی عه‌قره‌ راگه‌یه‌ندراوه‌، ئه‌مجاره‌ له‌ قائیمقامیه‌تی ناوبراو ته‌له‌گرافنامه‌ وه‌رگیراوه‌، ئاماژه‌ی پێكراوه‌ بۆ ئه‌وه‌ی بوێره‌كان دوور بخرێنه‌وه‌، له‌ وه‌ڵامدا به‌ تابور راگه‌یه‌ندراوه‌، بۆ ئاماده‌كاری كردن ره‌زامه‌ندی نیشان داوه‌، بۆ سه‌قامگیری ئاسایش ٥٠ پیاده‌ و ٢٠ سواره‌ له‌ ژاندارمه‌ یه‌ك هێز به‌ هاوكاری قائیمقامیه‌ت بۆ بارزان نێردراوه‌، زانیاریش دراوه‌ته‌ قوماندانیه‌تی له‌شكری قول، له‌ ١٥ ئۆغستۆس ١٣٣٠.

والی نه‌زیف

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

DH.ŞFR.00439.00036.001

| DH.ŞFR. | 00439.00036 | 9 شەوال 1332 |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>شێخی بارزان دووبارە لە راژان گەڕاوەتەوە ناوچەی خوی، لەسەر ئەمە شەهبەندەری رومیە باڵیۆزی رووسیا لەگەڵ میری ئاڵای ئەرکانی جەنگی لە ئەنجامی چاوپێکەوتنیان رێککەوتوون کە لەم کاتە ناسك و گرنگە لە نزیك سنوور واز لە شێخی ناوبراو ناهێنرێت و بە گوێرەی ووتەکانیان جموجۆڵی شێخ نابێت لە پێش چاوەکان وون بکرێت، لەلایەن شەهبەندەری ناوبراو راگەیەندراوە، ١٨ ئۆغستۆس ١٣٣٠.<br>والی تەحسین | | |

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

L'état n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

DH.ŞFR.00439.00037.001

| DH.ŞFR. | 00439.00037 | 9 شەوال 1332 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە

رووسەکان شێخی بارزانیان ناردۆتە لایەنی دیلمان، مەبەستیان ئەوەیە بە لایەنگران و هۆزەکانی خودی خۆی شتێك بۆ خۆیان بکەن، لە شەهبەندەری خوی زانیاری دراوە، ١٨ ئۆغستۆس ١٣٣٠.

والی تەحسین

TELEGRAMME تلغرافنامە

دولت علیۀ عثمانیه تلغراف ادارەسی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

RECEPTION

DH.ŞFR.00439.00060.001

| 10 شەوال 1332 | 00439.00060 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لە ١٦ و ١٧ ئۆغستۆس ١٣٣٠ شێخی بارزان لە بارەی هاتنەوەی بۆ بارزان هیچ هەواڵێك و زانیارییەك نییە، بەڵام بەشێك لە دیوانەکانی لە ئێران دووچاری نەهامەتی بوونەتەوە، بە گەرانەوەیان بوێری هەندێك رووبەرووبوونەوەیان کردووە، هێزی ژاندارمە ئامادە کراوە و رۆیشتوون، لەگەڵ ئەوانیش هەندێك هۆزی ملکەچ لەگەڵیانە، بۆ تەمبێ کردن و دوورخستنەوەی بارزانیەکان بریار دراوە، ١٩ ئۆغستۆس ١٣٣٠.
سلێمان نەزیف والی موسڵ

DH.ŞFR.00441.00065.001

DH.ŞFR.00441.00065.001

| DH.ŞFR. | 00441.00065 | 29 شەوال 1332 |
| --- | --- | --- |

بەپەلەیە
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وێنەیەکی دراوەتە نەزارەتی جەنگی
بە فیداکاریەکی گەورە شێخی بارزان عەبدولسەلام لەگەڵ پێنج لە هاوەڵانی لە ئێران دەستگیرکراون، دوو شەهید دراوە، هەروەها رادەستی بلۆکی سەر سنووری باچەرگە کراوە، هێزی رووسەکانیش یەك مەفرەزە تۆپ و .... ی ناردووە، دوێنێ کاتژمێر چوار یەکێك لە سەرۆکەکانی قاردار تەیمور گوندەکەی ئابڵوقەداوە، لەگەڵ ئەو مەفرەزەیە هۆزەکە رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە، لە ماوەی ٢٤ کاتژمێرە ئەو شەرە درێژەی هەبووە، لە قاردارەکان ١٥ شەهید هەیە، لە تەیمور ٦٥ کەس لە ئابڵوقەکە رزگاریان بووە، هاتوونەتە گوندی هەشتیان، ئەمە بە موتەسەرفی هەکاری راگەیەندراوە، شوێنی رووبەرووبوونەوەکە لە بلۆکی سەر سنووری باچەرگە سێ کاتژمێر دوورە، لەلایەن ئیسماعیل ئاغای قاردار لە شوێنی رووبەرووبوونەوەکە هەواڵ نێردراوە، رووسەکان گەیشتوونەتە شوێنی رووبەرووبوونەوەکە ئێمە لە سنوورەکانیان ئامادەکاری پێویستمان کردووە، ئەنجامەکەم راگەیاندووە.


باب عالی
داخلیه نظارتی

i.DH 1508/1332.B/21
68

İ.DH.01508

| I.DH. | 01508.000068 | 9 رەجەب 1332 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
١١٩٩٩ گشتی
٥١٣ تایبەتی
جەنابی سەدارەتپەناهی
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
لە ناو ویلایەتی موسڵ لە ڕووی کارگێریەوە لە چینی سێیەم قەزای زێبار ڕێك دەخرێت، بۆ قائیمقامیەتەکەشی بە هەمان مووچە کە وەریدەگرێت، قائیمقامی قەزای عەقرە محەمەد خاڵس ئەفەندی بە گواستنەوە دادەمەزرێت، لەسەر ئاماژەی ویلایەت لەگەڵ لیستی فەرمانی پاشا هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٩ ڕەجەب ١٣٣٢ و لە ٢١ مایس ١٣٣٠.
نازری ناوەخۆ


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
4266 319908 2

BEO.004266.319908.002

| BEO. | 004266.319908 | 3 ڕەبیعی کۆتایی 1332 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری سیاسی
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
لە بارەی سەفوەت کە لە قائیمقامیەت دەرکراوە
ڕاگەیەندراوی بەندە

هاوپێچ نووسراوی مێژووی ١٦ کانوونی یەکەم ١٣٢٩ ژمارە ١٠٢٦ سەفوەت لە قائیمقامیەت دەرکراوە، بە دڵنیاییەوە لەوەی کراوە لە وەڵامدا ڕاپۆرتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە وەرگیراوە، بە تێروانین لە لێکۆڵینەوەی فەرمانبەرانی ڕومیە، سەفوەت لەو شوێنە نەدۆزراوەتەوە، ئەگەر لە لێکۆڵینەوە هەواڵی ئەوە هات کە لە بارزانە، یەکسەر دەست بەسەر بکرێت و لەسەر سنوور ڕادەستی فەرمانبەرانی عوسمانی بکرێت، فەرمان دراوە، ئەمجارە نووسراو بۆ باڵیۆزخانەی تەهرانیش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

لە ٣ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٣٢ و لە ١٦ شوبات ١٣٢٩
ڕاوێژکار بە ناوی نازری دەرەوە

| 13 رەجەب 1332 | 004290.321705 | BEO. |
|---|---|---|

١٣ رەجەب ١٣٣٢
٢٥ مایس ١٣٣٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بـە مێـژووی ٢١ مایـس ١٣٣٠ ژمـارەی تایبـەت ٥١٣ وەڵامـی نـووسراوی سـەرووە، قائیمقامـی قـەزای عەقـرە، محەمـەد خاڵـس ئەفەنـدی بـەم مووچەیـەی کـە وەریدەگرێـت دەگوازرێتـەوە بـۆ قـەزای زێبـار و دادەمەزرێـت، بـۆ دامەزراندنەکەشـی بـە فەرمانـی پاشـا جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی و ڕەزامەنـدی لەسـەر دراوە، وێنـەی پەسـەند کراویشـی لەلایـەن دەوڵەتـەوە لەبـەر دەسـتە بـۆ نووسـینەوە.


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

باب عالی
داخلیه نظارتی
امنیت عمومیه مدیریتی
قلمی
عمومی
خصوصی



DH.ŞFR.00052.00317.001

| 26 جەمادی کۆتایی 1333 | 00052.00317 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی
بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە
تایبەتی ١٢
لە شەڕی بەسرا کاری باشی کردووە و لە مەسەلەی بارزانیش سوودی هەبووە، بە ئامادەنەبوونی لە دادگای رواندز، عەبدوڵڵا پاشازادە سەعید بەگ بۆ ڕێزلێنانی لەلایەن نێردراوی بەغداد تۆفیق بەگ بە میهرەبانیەوە داوا کراوە ڕێزلێنانی پێ بدرێت، ڕاگەیەندراوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت، لە ٢٨ نیسان ١٣٣١.
نازر تەڵعەت




3

İ.HB.00167.00052.003

<table>
<tr><td>I.HB.</td><td>00167.00052</td><td>22 جەمادی یەکەم 1333</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی جەنگی<br>فەرمانگەی نووسراو<br>قەڵەمی نووسین<br>١٤٩<br>فەرمانی پاشا<br>کوڕی عەدیلە کوڕی محەمەد رواندزی لەگەڵ رەشۆ و مستەفا کوڕەکانی فەقێ سۆفی یەکێکن لە دێوانەکانی شێخی بارزان عەبدولسەلامی لەسێدار دراو، ناوبراوان لەگەڵ کەسانی تر لە رووداوەکەی مێرگەسور بەرامبەر سەربازی شاهانە چەکیان بەکارهێناوە، لە کاتی دادگاییکردندا پەسەند کراوە، بە پشت بەستن بە سزای یاسایی ماددەی ٥٧ و مێژووی دەستگیرکردنەکەیان هەر یەکە سێ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان لە دیوانی جەنگی عورفی موسڵ بڕیاری لەسەر دراوە و پەسەند کراوە.<br>لە ٢٢ جەمادی یەکەم ١٣٣٣ و لە ٢٥ مارت ١٣٣١</td></tr>
</table>



I.HB.00170.00040.003

| I.HB. | 00170.00040 | 24 شەعبان 1333 |
|---|---|---|

نەزارەتی جەنگی
فەرمانگەی نووسراو
٦٧٥
فەرمانی پاشا
تەحسیلدار (تحصیلدار) تۆفیق ئەفەندی کوڕی حاجی حوسین ئەفەندی بۆ کۆکردنەوەی داهاتی یەك مانگی ناحیەی زێبار سەر بە قەزای عەقرە ڕۆیشتووە، لەگەڵ هاوەڵانی لە ژاندارمە تووشی کەسانێك بوون چەکیان بەرامبەریان راگرتووە، لەوانە مستەفا کوڕی عومەر بریندار کراوە و مامەڵەی زۆرەملێ و توندوتیژیان ئەنجام داوە، چەك و جبەخانە و ئاژەڵەکان و ئەو ئاقچانەی کە هی میرینە بە تاڵان بردراون، بە گومانەوە فەقی عەبدولرەحمان کوڕی مستەفا هاوکاری شێخی بارزانی لە سێدارەدراو عەبدولسەلام، لەگەڵ هاوەڵانی لە ئەنجامی ئەو دادگاییەی کە بۆیان ئەنجام دراوە، ئەوانە بەرامبەر حکوومەت یاخی بوونە و لە دژی سەربازی شاهانە چەکیان بەکار هێناوە و هۆکار بوونە بۆ کوشتنی خەڵك، بۆیە لە دیوانی جەنگی عورفیە بە خۆشحاڵیەوە بارزانی بە سزای لە سێدارەدان سزا دراون، لەگەڵ ئەوانەی سزای هەتاهەتایەیان بە سەوڵ لێدان بەسەردا سەپێنراوە، ئەو سزایەی لەسەریان سەپێنراوە سەرەتا پەسەند کراوە، لە بارەی ناوبراوان جارێکی تر پێویستی بەوە نەماوە سزایان بەسەردا بسەپێنرێتەوە، پیاوەکانی ناوبراوان ئەوانەی گومانیان لەسەرە یوسف و حەسەن و ئەحمەد و هەست کوڕی مەلا حەسەن و مەلا کوڕی مەلا مەحمود و رەمەزان و مەلا شەفیق و خالید موختاری گوندی هەسنی هەروەها حەسەن لە گوندی ناوبراو و کورەکانی مەلا مەحمود، تەها و حەسەن لە گوندی بیبانە و عەزیز و یونس کەلکوان لە گوندی هوستان و مەلا بارزانی و ئەحمەد و محەمەد و مەحمود و حەسەن چیچ و چیچۆ و پیچ بە سزای یاسانامەی ماددەی ٢٥٢ هەر یەکە بە ٥ ساڵ سزا دراون، جگە لەوە حەسەن موختاری گوندی هەفندگا دەستی لەم کارە هەبووە، بە ماددەی ٤٥ بە پشت بەستن بە ماددەی ناوهاتوو بە ٣ ساڵ و ٤ مانگ بە سزای سەوڵ لێدان هەروەها پارەوپول و کەلوپەلی تاڵان کراو و لە هەر یەکەیان ٥ نیشانی مەجیدی زێر کە بردراوە، لە دیوانی جەنگی عورفیەی موسڵ بە ئامادەنەبوونیان بە بریار بەسەریاندا ساغ بۆتەوە.
بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری جەنگی سپێردراوە، لە ٢٤ شەعبان ١٣٣٣ و لە ٢٤ حوزەیران ١٣٣١.
وەکیلی باش قوماندان و نازری جەنگی
سەدری ئەعزەم

2 varak
(2 shf boş)

MV. 196/111

MV.00196

| MV. | 00196.00111 | 6 ڕەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|

٦ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٣٣
٨ شوبات ١٣٣٠
پوختەی دارایی
نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ لە مێژووی ٧ شوبات ١٣٣٠ ژمارە ١٦٥١ خوێندراوەتەوە.

بریار
لە نووسراوی باسکراودا نوسراوەتەوە، لە ڕێکخستنی کارگێری قەزای زێبار، سەرەتا لە بەرێوەبەرایەتی زێبار شوسلی عوسمان ئاغا لەگەڵ زیاتر لە ١٠٠ خۆبەخش چۆتە خانەی جەنگی (دار الحرب) لە بەسرا، لە بارەی بارودۆخی بارزان و ئەوەی پەیوەستە بە ئەرکەکەی لە بارەی ئەو چاودێری کردنەی کە جێبەجێ دەکرێت، بۆ دواخستنی ئەو چاودێری کردنەش بە ئاماژەی نەزارەتی دادوەری و زانیاری نەزارەتی ناوەخۆ نووسراو کراوە.


OSMANLI ARŞİVİ
DH.EUM. MH
257 11

| 25 موحەررەم 1333 | 00257.00011 | DH.EUM. |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
ژمارە ١٦٦
بۆ نەزارەتی دارایی جەلیلە
بۆ جەنابی دەوڵەت

لـە کاتـی هەندێـك لێکۆڵینـەوەدا پۆلیسـی قۆمیسـیۆن ئامـادەن بـۆ ئـەوەی بچنـە قەزاکانـی عەقـرە و زێبـار، بـۆ ئیسـماعیل بـەگ لـە مێـژووی ٢٩ مایـس ١٣٣٠ و ٢١ حوزەیـران ١٣٣٠ ژمـارە ٣١ و ٣٥ لەگـەڵ دوو پارچـە داواکاری ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت داواکـراوە کـە ٣٠٠٠ قـوروش حەواڵـە کـراوە و فەرمـان دراوە بـۆ خـەرج کردنـی، بە گوێـرەی لێکۆڵینـەوە ووتەکانـی ژمێریـاری ویلایـەت داوای بەزەیـی کـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ٢٥ موحـەررەم ١٣٣٣ و لـە ٢٩ تشرینـی دووەم ١٣٣٠.

والی موسڵ

ADMINISTRATION DES TÉLÉGRAPHES OTTOMANS

L'Etat n'accepte aucune responsabilité à raison du service de la télégraphie

Il n'y a rien à payer au porteur

No d'ordre — Bureau intermédiaire — Date — H — M — Matin / Soir — Signature

Expédition ou Retransmission — No — Date — H — M — Matin — Signature

De — No — Mots — Date — H — M — Voie — Indications éventuelles

DH.ŞFR. 405/105

Dans les télégrammes imprimés, le premier nombre après le nom du lieu d'origine est un numéro d'ordre, le second indique le nombre des mots taxés, les autres désignent la date et l'heure du dépôt.

DH.ŞFR.00455.00105.001

| 9 سەفەر 1333 | 00455.00105 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|
| دوای لە سێدارەدانی شێخی بارزان ئەو لایەنانەی هاتوونەتە ژێر سێبەری دەوڵەت، بۆ ئەوەی بنێردرێنە خانەی جەنگی (دار الحرب) نێردراونەتە بەغداد.<br>لە ١٤ کانوونی یەکەم ١٣٣٠<br>سلێمان نەزیف بە ناوی والی | | |

DH.ŞFR. 497/14

DH.ŞFR.00497.00014.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00497.00014</td><td>30 رەمەزان 1333</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە هۆزی زێبار عوسمان ئاغا زادە قادر ئاغا بە ٢٠٠ کەسی چەکدار چوونەتە سەر بەغداد، لە ٢٩.<br>والی حەیدر</td></tr>
</table>

| 7 رەبیعی کۆتایی 1333 | 004339.325382 | BEO. |
| --- | --- | --- |

٧ رەبیعی کۆتایی ١٣٣٣
٩ شوبات ١٣٣٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆ و دادوەری جەلیلە
نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ٧ شوبات ١٣٣٠ ژمارە ١٦٥١ ئاماژەی پێکراوە، پێشەکی لە ڕێکخستنی کارگێری قەزای زێبار، شوسلی عوسمان ئاغا لە بەڕێوەبەرایەتی قەزای زێبارە لەگەڵ زیاتر لە ١٠٠ خۆبەختکار بۆ خانەی جەنگی (دار الحرب) بەسرا بەڕێکەوتوون، لە بارەی بارودۆخی بارزان ئەوەی پەیوەستە بە ئەرکەکەیەوە لەلایەنی مولکیەوە جێبەجێ دەکرێت، بۆ دواخستنی چاودێریکردنەکەش لەسەر ئاماژەی نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە، بە ئەنجوومەنی بریکارەکان سپاردراوە، شێوازی جێبەجێ کردنەکەی بە نەزارەتی دادوەری ڕاگەیاندووە، بۆ جێبەجێ کردنی نووسراو کراوە.


دائرۂ صدارت امور مهمه قلمی

| اوراق نومروسی | مسودی | مبیضی | | قلم نومروسی |
|---|---|---|---|---|
| قلمه ورودی تاریخی | تاریخ تسوید | تاریخ تبییض | | مقابله ایدنلر |



<table>
<tr><td>BEO.</td><td>004343.325724</td><td>29 ڕەبیعی کۆتایی 1333</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٩ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٣٣<br>٣ مارت ١٣٣١<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە<br>لە مێژووی ٢٦ شوبات ١٣٣٠ ژمارە ١٠٨٦ وەڵامی نووسراوی سەرووە، فەرمانی لەسێداردانی شێخی بارزان، کە ئەندامێکە لە دامەزرێنەری چەتەکان، بوێریان کردووە هەندێك کردەوەی نایاسایی ئەنجام بدەن، بە دادگا لەسەریان ساغ بۆتەوە، لە قەزای عەقرە لەگەڵ پێنج لە هاوەڵانی بە پلەی جیاواز سزا دراون، لە دیوانی جەنگی عورفی موسڵ بریار دراوە، بۆ پەسەند کردنی جەنابی پاشا فەرمان دەدات، وێنەی پەسەند کراوی فەرمانی پاشا لە دیوانی سەربازی باسکراوە و لەگەڵ داواکاریەکە بەیەکەوە بۆ لایەنی دەوڵەت نێردراوە.<br>١ مارت ١٣٣١ لەسەر فەرمانی پاشا</td></tr>
</table>

دائرۀ صدارت قلم مخصوصی



<table>
<tr><td>25 جەمادی یەکەم 1333</td><td>004348.326099</td><td>BEO.</td></tr>
<tr><td colspan="3">٢٥ جەمادی یەکەم ١٣٣٣<br>٢٨ مارت ١٣٣١<br>بۆ نەزارەتی جەنگی جەلیلە<br>وەڵامی نووسراو لە مێژووی ٢٣ مارت ١٣٣١ ژمارە ٩٢ لە هاوەڵانی شێخی بارزان عەبدولسەلامی لە سێدارە دراو، لە رووداوی مێرگەسور بەرامبەر بە سەربازی شاهانە چەکیان راگرتووە و بەکار هێناوە، لە کاتی دادگاییکردندا پەسەند کراوە، کوڕی عەدیلە کوڕی محەمەد رواندزی و هاوەڵانی لە دیوانی جەنگی عورفی بریاری سزادانیان بۆ دەرچووە، لە دوای راگەیاندنی بریارەکە لەلایەن جەنابی پاشا پەسەند کراوە، وێنەیەکی پەسەند کراوی فەرمانی پاشا لەگەڵ داواکاری دیوانی جەنگی بەیەکەوە بۆ پەیوەندیدارانی دەوڵەت نێردراوە.</td></tr>
</table>

دائرهٔ صدارت امور مهمه قلمی

اوراق نومروسی ٦٧٥ | مسودی | مبیضی | قلم نومروسی ٨٧٧

قلمه ورودی تاریخی | تاریخ تسوید | تاریخ تبییض | مقابله ایدنلر



مطبعهٔ عامره

| BEO. | 004363.327199 | 25 شەعبان 1333 |
|---|---|---|

٢٥ شەعبان ١٣٣٣
٢٥ حوزەیران ١٣٣١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٣ حوزەیران ١٣٣١ ژمارە ٤١٦ یە لە بەرامبەر تەحسیلدار (تحصیلدار) و ژاندارمە چەکی راگرتووە هەروەها مامەڵەی بە زۆری و توندوتیژی بەکار هێناوە، بوێریان کردووە کەلوپەل و پارەوپولیان تالان کردووە، لە کاتی دادگاییکردندا پەسەند کراوە، پیاوەکانی شێخی بارزان عەبدولسەلامی لە سێدارەدراو کە ناوەکانیان دیارە، بە پلەی جیاواز سزا دراون، ئەو بریارانەی کە لە دیوانی جەنگی عورفی موسڵ دراوە، دوای راگەیاندن جەنابی پاشا پەسەندی کردووە، لەم بارەیەوە وێنەی پەسەند کراوی فەرمانی پاشا لەگەڵ داواکاری دیوانی جەنگی ناوهاتوو بەیەکەوە هاوپێچ بۆ لایەنی دەوڵەت نێردراوە بەرێزم.




هو

دائرۀ مشيخت اسلاميه
مكتوبى قلمى
عدد ١٤٢

موصل ولايتنه
داخليه شفره سيله

ج ٢٣ مارت صراحت قانونيه يه نظراً محمد امين افنديك زيبار قاضيلكنه اصالةً تعيينى ممكن اولميوب انجق بيك غروش معاشله وكالةً تعيينى قبول ايدلديكى تقديرده اشعارى

٢٧ مارت ٣٣٢



DH.ŞFR.00062.00277.001

<table>
<tr><td>5 جەمادی کۆتایی 1334</td><td>00062.00277</td><td>DH.ŞFR.</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی فەتوا<br>فەرمانگەی شێخولئیسلام<br>قەڵەمی نووسین<br>ژمارەی شیفرە ١٤٢<br>بۆ ویلایەتی موسڵ<br>بە شیفرەی ناوەخۆ<br>لە ٢٣ مارت بە تێروانین لە یاسا سەبارەت بە دامەزراندنی محەمەد ئەمین ئەفەندی وەکو قازی زێبار ناکرێت جێبەجێ بکرێت، بەڵام رەزامەندی دراوە بە مووچەی ١٠٠٠ قوروش بە وەکالەت دابمەزرێت، بۆ ئاگاداری.<br><br>راوێژکاری شێخی ئیسلام<br>لە ٢٧ مارت ١٣٣٢</td></tr>
</table>


DH.SN.THR.00068.00009.002


DH.SN.THR.00068.00009.004

| DH.SN.THR. | 00068.00009 | 7 جەمادی کۆتایی 1334 |
|---|---|---|

- بۆ بەڕێوەبەرایەتی کارگێری تۆماری ناسنامەی گشتی دەرسەعادەت
ڕاگەیەندراوی بەندەکانە
لـە قـەزای زێبـار تـازە فەرمانبـەری ناسـنامە دادەمەزرێـت، بۆیـە یـەك دانـە مـۆر دروسـت بکرێـت و بنێردرێـت، هەروەهـا بـۆ قـەزای ناوهاتـوو بـۆ سـێ مانگ خشـتەی تایبەت بـە ئامـار بنێردرێت، لەسـەر داواکاری بـە بوێرییەوە داوای هـاوکاری کـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە بریـار دەردەکات.
لە ١٦ تشرینی دووەم ١٣٣١
بەڕێوەبەری ناسنامەی ویلایەتی موسڵ

چوار دانە خشتە دەنێردرێت

- ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی نووسین
٢٢ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
بۆ جەنابی نازر بەگی ئەفەندی
لـە تۆمـاری کارگێـری ناسـنامەی گشـتی نـووسراوی ژمـارە ٤٠١ لـە مێـژووی ١٣ کانوونـی دووەم ١٣٣١ وەڵامـی نەزارەتپەناهیـە، بـە نـاوی فەرمانبەرایەتـی ناسـنامەی زێبـار یـەك پارچـە مـۆری فەرمـی دروسـت کـراوە و نێـردراوە، رادەسـتی فەرمانبەرایەتـی ناسـنامەی ناوهاتـوو کـراوە، ئەمـەش لـە بەڕێوەبەرایەتـی ناسـنامە بـاس کـراوە، ئەمـر و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
لە ٧ جەمادی کۆتایی ١٣٣٤ و لە ٢٨ مارت ١٣٣٢
بریکاری والی موسڵ

DH. ŞFR 522/95

DH.ŞFR.00522.00095.001

| DH.ŞFR. | 00522.00095 | 8 شەعبان 1334 |
| --- | --- | --- |
| سبەی دەچمە زێبار، لەوێش بۆ عەمادیە و زاخۆ دەرۆم، هەوڵیش دەدەم هێڵەکە بخەمە ژێر پارێزبەندیەوە.<br>قوماندانیەتی موسڵی رۆژئاوا والی حەیدەر | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

باب عالی
داخلیه نظارتی
مأموریه قلمی مدیریتی
موصل ولایتنه
شفره

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
71 | 30

DH.ŞFR.00071.00030.001

| 22 سەفەر 1335 | 00071.00030 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی قەڵەمی فەرمانبەران
بۆ ویلایەتی موسڵ
شیفرە
ژمارە ٨٠
نووسراوی زیادکراوە تەلەگرافی ٢٢ ئەیلوول ١٣٣٢ خاڵس ئەفەندی قائیمقامی زێبار ئەو تەلەگرافنامەیەی کە ناردوویەتی سەبارەت بە شێخی بارزان کە لە ژێر چاودێری کردن دایە، لەگەڵ خزمی شێخی بارزان بەرکەوتنێك روویداوە، لەم ئەرکەی خۆی بە ستەملێکراو دەزانێت، بۆیە بە گوێرەی راگەیەندراوەکەی داوای کردووە بگوازرێتەوە، لە بارەی ئەوەوە ئەو نووسراوانەی کە نەهاتووە داوای کردووە ئەرکەکەی بۆ شوێنێکی تر بگۆردرێت، لەبەر ئەوەی ئاماژەکان نەهاتوون، بۆیە بە پەلە نووسراوەکانی بنێردرێت، لە کانوونی یەکەم ١٣٣٢.
نازر تەڵعەت







| I.DUIT. | 00114.000041 | 9 جەمادی کۆتایی 1335 |
| --- | --- | --- |

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و ناسنامەی کەسێتی
بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
پوختە: لە بارەی دوورخستنەوەی قائیمقامی زێبار خاڵس ئەفەندی لیستی فەرمانی پاشا هاوپێچە

راگەیەندراوی بەندەتانە
قائیمقامی قەزای زێبار بەهۆی خراپی بەڕێوەبردنی کارگێری و مامەڵەی نایاسایی لە ویلایەتی موسڵ دەستی لە کار کێشاوەتەوە، خاڵس ئەفەندی بە تاوانکردن تۆمەتبار کراوە، بۆ دادگایی کردنی بریار دراوەتە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت، داواکاریش بە مەبەستی وردبینی دراوەتە شورای دەوڵەت هەروەها تێروانین لەو حاڵەتە بەردەوام بوون لەسەر ئەرکەکەی بە نەگونجاوی بینراوە، بە گوێرەی ئەو بریارەی کە لە شورای دەوڵەت دەدرێت، لەم بارەیەوە بۆ بریاری کۆتایی دوورخستنەوەی تەنیا بە بریاری بەڕێوەبەرایەتی بە رێککەوتن لەگەڵ فەرمانی پاشا کە بە هاوپێچ پێشکەش کراوە دەکرێت، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری ناوەخۆ
لە ٥ جەمادی کۆتایی ١٣٣٥ و لە ٢٩ مارت ١٣٣٣

- بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
تایبەتی ٢٠٥
فەرمانی پاشا
قائیمقامی زێبار خاڵس ئەفەندی دوورخراوەتەوە، ئەم کارە بە فەرمانی پاشاوە بۆ نازری ناوەخۆ ئەرکە، لە ٩ جەمادی کۆتایی ١٣٣٠ و لە ١ نیسان ١٣٣٣.

DH. ŞFR 546/27

DH.ŞFR.00546.00027.001

| 27 رەبیعی کۆتایی 1335 | 00546.00027 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|
| سەربازە روسەکان هاتوونەتە لای شەمدینان لەگەڵ کوردە دڵسۆزەکان رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە، لە کۆتاییدا لە شەمدینان سەرۆکی هۆزی هەرکی، رەشید بەگ کە لەگەڵ روسەکان لایەنگری یەکترن، لە ئەنجامی ئەو ئامادەکاریەی کە کراوە، بە بێ رووداو لە زێبار دەستگیر کراوە. | | |

شورای دولته مخصوص مسوده ورقه‌سی





ŞD.02210.00021.001

| ŞD. | 02210.00021 | 29 شەعبان 1335 |
|---|---|---|

٢٩ شەعبان ١٣٣٥
٢٠ حوزەیران ١٣٣٢
لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایەتـی موسـڵ هاوپێچـی بریارنامەی مێـژووی ٢١ کانوونـی یەکـەم ١٣٣٢ ژمارە ٣١ بریارنامـە نێردراوە
قائیمقامـی قـەزای زێبـار خاڵـس ئەفەنـدی و بەڕێوەبـەری دارایـی عیزەددیـن ئەفەنـدی لەسـەر تـاوان پێویسـتی کـردووە دادگایـی بکرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە ئەنجوومەنی کارگێـری ویلایەتـی موسـڵ بریـار دراوە، بۆ ئـەم کارەش بریارنامـە و هاوپێچەکانـی لـە نەزارەتـی ناوەخـۆ نووسراوەتـەوە و لـە مێـژووی ١٥ مـارت ١٣٣٣ ژمـارە ٢٨ بـۆ شـورای دەوڵـەت نێـردراوە، لـە کۆتاییـدا ئـەو کاغەزانـەی کـە هاتـووە لەگـەڵ یـەك بەسـتراونەتەوە، ناوبـراوان لـە مـاوەی یاسـایی خۆیـدا گازاندەیـان داوە، لـە فەرمانگـەی پلـە دووی مەعاریفـی مولکیـە لـە کاتـی ووردبینـی دەرکەوتـووە ناوبـراوان لـە کاروبـاری ئەرکەکانیانـدا بـە خراپـە ئەرکەکانیـان جێبەجـێ کـردووە، لـە یاسـای تاوانیـش مـاددەی ١٠٢ بریـاری دادگاییکردنەکەیـان بـە گۆڕانـکاری پەسـەند دەکرێـت، لـە مێـژووی ١٢ حوزەیـران ١٣٣٣ بریـاری لەسـەر دراوە.

| 10 جەمادی کۆتایی 1335 | 004462.334610 | BEO. |
|---|---|---|

١٠ جەمادی کۆتایی ١٣٣٥
٢ نیسان ١٣٣٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
لـە مێـژووی ٢٩ مـارت ١٣٣٣ ژمـارە ٨٨ ی تایبەتـی وەڵامـی نـوسراوی سـەرووە، لە بـارەی دوورخسـتنەوەی قائیمقامی قـەزای زێبـار خاڵـس ئەفەنـدی بـە فەرمانی پاشـای جەنابـی پادشـا فەمانـی داوە، وێنەی پەسـەندکردنەکە بـۆ لایەنی پەیوەندیـدار نێردراوە.
لە مێژووی نیسان ١٣٣٣ لەسەر فەرمانی پاشایە



| DH.HMŞ. | 0003.00001.92 | 25 جەمادی کۆتایی 1336 |
|---|---|---|

لـە بـارەی دادگایـی کردنـی قائیمقامـی پێشـووی قـەزای زێبـار خاڵـس ئەفەنـدی و بەڕێوەبـەری دارایـی عیزەددیـن ئەفەنـدی.

بۆ نەزارەتی جەلیلە – پەراوێز

بـە گوێـرەی ئـەو دۆسـیەی کـە لێکۆڵینـەوەی لەسـەر کـراوە، بـە تێروانیـن لـە لێکۆڵینەوەکـە قائیمقامـی پێشـووی قـەزای زێبـار خاڵـس ئەفەنـدی و بەڕێوەبـەری دارایـی عیزەددیـن ئەفەنـدی ئـەو دادگاییـەی بـۆ ئـەوان کـراوە لەسـەر ئـەو بڕیـارەی لـە شـورای دەوڵـەت لـەم بارەیـەوە دراوە، لەسـەر ئـەو ووتانـەی کـە شـایەدەکان داویانـە پێویسـتە خێـرا کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، بـۆ ئەمـەش داواکاری گشـتی ئـاگادار کراوەتـەوە و دۆسـیەکەش هەڵگیـراوە.

٧ نیسان ١٣٣٤


DUIT 46/36

2

İ.DUİT.00046

| I.DUIT. | 00046.000036 | 27 موحەڕڕەم 1336 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی
٣٠٣٠٣ گشتی
پوختە
ڕەزامەندی دامەزراندنی قائیمقامی هیندیە، عەبدولعەزیز ئەفەندی بۆ قائیمقامیەتی زێبار.

بۆ جەنابی سەدارەتپەناهی
قائیمقامی هیندیە سەید عەبدولعەزیز ئەفەندی دوورخراوەتەوە، ئێستا بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار دادەمەزرێت بە هەمان مووچە بگوازرێتەوە بۆ قەزای زێبار و دابمەزرێت، ئەمەش تەنیا بە بریاری بەڕێوەبەرایەتی دەبێت، بە ڕێککەوتن لیستی فەرمانی پاشا بە هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەمر و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات، لە ٢٧ موحەڕڕەم ١٣٣٦.
نازری ناوەخۆ




DH.ŞFR.00080.00238.001

| 15 موحەررەم 1336 | 00080.00238 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ/ شیفرە
بەرێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی
٩٢ تایبەتی
لە ١٥ تشرینی یەکەم ١٣٣٣ شیفرە، گۆڕینەوەی ئەرکی هەردوو قائیمقامیەتی رانیە و مەعمورە لاری نەبوون نیشان دراوە، سەرەتا کەمال بەگ لە سافوردان دوور خراوەتەوە و لە عەقرە دامەزراوە، حامی بەگ قائیمقامی بەشیری بۆ تەرمیە هەروەها یوسف کەنعان بەگ قائیمقامی دەلیم بۆ بەشیریە ئەرکەکەیان گۆردراوەتەوە، فوئاد بەگیش بێ تاقیکردنەوە و بە گوێرەی نیزام دامەزراندنی وەکو قائیمقام گونجاو نییە، بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوە پرسیارەکانی دەنێردرێت، دوای ئەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکە گرنگی خۆی نیشان دەدات، بۆ دامەزراندنی لە ئێستاوە رێگە پێدراوە بە مووچەی چینی یەکەم بە نیوە مووچە لە قائیمقامیەتی زێبار بە وەکالەت دادەمەزرێت، لەگەڵ رەزامەندی رادەگەیەندرێت، لە ٣١ تشرینی یەکەم ١٣٣٣.

به ناوی نازر




DH.ŞFR.00081.00194.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00081.00194</td><td>1 سەفەر 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی<br>گشتی ٣٠٤٢١<br>بۆ ویلایەتی موسڵ/ شیفرە<br>بە مووچەی چینی دووەم قائیمقامی هندیە سەید عەبدولعەزیز ئەفەندی لە گواستنەوەی بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار لە مێژووی ١٥ تشرینی دووەم ١٣٣٣ فەرمانی پاشای لەسەر دراوە، لە ٢٠ تشرینی دووەم ١٣٣٣.<br>بە ناوی نازر</td></tr>
</table>




DH.ŞFR.00082.00015.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR.</td><td>00082.00015</td><td>18 سەفەر 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی<br>گشتی ٣٠٩٢<br>بۆ موتەسەرفی زۆر<br>بەپەلەیە/شیفرە<br>لە ١ کانوونی یەکەم ١٣٣٣ شیفرە، عەزیز بەگ لە زێبار دامەزراوە، لە قوماندانیەتی سەردانی وەزارەت کراوە، وەڵامی فرقەی قوماندانیەتی دراوەتەوە هەروەها یارمەتی عەزیز بەگیش نەکراوە.<br>لە ٣ کانوونی یەکەم ١٣٣٣<br>بەناوی نازر</td></tr>
</table>


DH.ŞFR.00082.00030.001

| 18 سەفەر 1336 | 00082.00030 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی
گشتی ٣١٦١٧
بۆ ویلایەتی موسڵ
شیفرە
قائیمقامی زێبار عەبدولعەزیز ئەفەندی هەروەها قائیمقامی مەعمورە خەلیف ئەفەندی موچەکانیان زیادی کردووە، بۆ هەر یەکە ٥٠٠ قوروش زیادی کردووە.
بە ناوی نازر


DH.ŞFR.00082.00124.001

| 4 ڕەبیعی یەکەم 1336 | 00082.00124 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی
گشتی ٣٠٧٩١
بۆ موتەسەرفی زۆر
شیفرە
نـوسراوی هاوپێـچ ٣ کانوونـی یەکـەم ١٣٣٣ شـیفرە، عەبدولعەزیـز بـەگ لـە زێبـار دامـەزراوە، هەروەهـا ویلایەتـی موسـڵ ئـاگادار کراوەتـەوە کـە دەرکەوتـووە لـە بەرزبوونـەوەی پلەکـەی ئـاگادار نییـە، بۆیـە پەلـە بکرێـت لـە ناردنـی، ئەمـڕۆ جولـە بـکات.
لە ١٨ کانوونی یەکەم ١٣٣٣
بە ناوی نازر



| 22 ڕەبیعی یەکەم 1336 | 00083.00035 | DH.ŞFR. |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری باری کەسێتی<br>گشتی ٣٠٧٩١<br>بۆ موتەسەرفی زۆر<br>شیفرە<br>هاوپێچ لە ١٨ کانوونی یەکەم ١٣٣٣ شیفرە، قائیمقامی زێبار عەزیز بەگ لە هەر شوێنێك بوونی هەیە و بۆی ڕۆیشتووە، مێژووەکەی ڕابگەیەندرێت، لە کانوونی دووەم ١٣٣٤.<br>بریکار بە ناوی نازر | | |



ŞD.02210.00028.001

| 3 موحەڕرەم 1336 | 02210.00028 | ŞD. |
|---|---|---|

٣ موحەڕرەم ١٣٣٦
٢٠ تشرینی یەکەم ١٣٣٣
هاوپێچی بریارنامەیەکی تر لە مێژووی ١٥ ئۆغستۆس ١٣٣٣ بریارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵە
ژمێریاری تایبەتی قەزای زێبار نەشئەت بەگ بۆ قەدەغەکردنی دادگاییکردنەکەی بریار لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی موسڵ دراوە و حەواڵە کراوە، هەروەها نووسراوی مێژووی ٩ ئەیلوول ١٣٣٣ ژمارە ٢٣٢/٢٩٣٦٣ بۆ شورای دەوڵەت نێردراوە، لەگەڵ ئەو بریارنامەیە کاغەزی پەیوەست لە فەرمانگەی مولکیەی مەعاریف لە پلە دوو ووردبینی بۆ کراوە، دەرکەوتووە ناوبراو بریاری قەدەغەکردنی دادگاییەکەی پەسەند کراوە، لە بارەی نەشئەت بەگ بە پشت بەستن بە راستییەکان ئەنجامدەرانی بخرێنە ژێر چاودێریەوە، یاسای چاودێریش جێبەجی دەکرێت و بۆ ئاگادارکردنەوەی شوێنی ناوبراو لە ١٥ ئەیلوول ١٣٣٣ بریاری لەسەر دراوە.

| 2 سەفەر 1336 | 004491.336823 | BEO. |
|---|---|---|

٢ سەفەر ١٣٣٦
١٧ تشرینی دووەم ١٣٣٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
مێژووی ١٣ تشرینی دووەم ١٣٣٣ ژمارە ٧٢١ تایبەتی وەڵامی نووسراوی سەرووە، بۆ قائیمقامیەتی قەزای زێبار قائیمقامی قەزای هیندیە سەید عەبدولعەزیز ئەفەندی دادەمەزرێت بۆ ئەم مەبەستە بە رەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی پاشا، وێنەی پەسەند کراوی بۆ لایەنی سەروو نێردراوە.

BEO.004525.339353.001

| BEO. | 004525.3393.53 | 18 شەوال 1336 |
|---|---|---|

١٨ شەوال ١٣٣٦
٢٧ تەمموز ١٣٣٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی جەلیلە
مێژووی ٢١ تەمموز ١٣٣٤ ژمارە ٦٧٨ وەڵامی نووسراوی سەروو بۆ قائیمقامیەتی قەزای رانیە قائیمقامی پێشووی قەزای زێبار خاڵس ئەفەندی دادەمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە بە فەرمانی پاشا جەنابی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی پەسەند کراوی بۆ لایەنی دەوڵەت نێردراوە.

لە مێژووی ٢٤ تەمموز ٣٣٤ فەرمانی پاشا

DH.ŞFR.00501.00109.001

| DH.ŞFR. | 00501.00109 | 12 رەبیعی یەکەم 1338 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>هەموو خەڵکی لاهیجان و سەلدوس گەرانەوە، لە گوندەکانیان نیشتەجێ بوون، باش قەلعە، گەوار، شکاك و باڵایەکان لە گوندەکانی عەقرە، زێبار، رواندز، هەولێر، رانیە و کۆی سانجەق نیشتەجێ بوون.<br>حەیدر والی موسڵ | | |




| HRT.H. | 0616 | 29 زیلحیجە 1341 |
|---|---|---|

نەخشەی سنووری قەزای زێبارە، تازە لە دەورووبەری موسڵ لە رووی کارگێرییەوە رێکخستنی بۆ کراوە، بە دەست ئامادەکراوە، لە نەخشەکەدا مەرکەزی قەزا و ناحیە دیاری کراوە.

# پێرست